چاپی دووەم
2010

سایە





پۆل ستراتێرن

وەرگێڕانی: موسعەب ئەدهەم

# ساتێک لەگەڵ ئەرستۆ

*زنجیرەی ناسینی فەیلەسوفەکان*

٤

# ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی

# سایە

ناوەنیشان: سلێمانی -- سابونکەران – تەنیشت شوقەکانی تەکیە رووتە

٠٧٧٠٢١١٩٥٦٤ - ٠٧٧٠١٥٥٠٨٥٣

## ساتێک لەگەڵ

# ئەرستۆ

پۆڵ ستراتێرن

و: موسعەب ئەدهەم

**چاپی یەکەم**

**٢٠١٠**

# ساتێک لەگەڵ ئەفلاتون

ناسنامەی کتێب:

ناوی کتێب: ساتێك لەگەڵ ئەفلاتون

نوسینی: پۆڵ ستراتێرن

وەرگێڕانی بۆ کوردی: مەسعەب ئەدهەم

دیزاین: ناوەندی سایـــــــە

تایپ: ئانیتا

شوێنی چاپ: چاپەمەنی سایە

ساڵی چاپ: چاپی یەکەم- زستانی - ٢٠١٠

تەژمار: ١٠٠٠

نـــرخ:٢٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی ( ١١٨٨ ) ی ساڵی ( ٢٠١٠ ) ی پێ دراوە.

# پێرست

## پێشەکی

ڕەنگە ئەرەستۆ یەکەمین و گەورەترین بیرمەندی هەمەلایەن و گشتگیر بێت، بەو جۆرەی کە بەناوبانگە، سەبارەت بە هەموو کارو بارێك.

لەتێڕامانی تیۆرییەوە سەبارەت بەچیەتی ڕۆح تاکو کەشناسی،شیعرو هونەر تەنانەت سەبارەت بەلێکدانەوەی خەو هەندێك شتی نوسیوە. وتراوە کە ئەرستۆ پەنجەی خستۆتە سەر هەر زانستێك ئەوە گۆڕانی تێدا کردووە. (جگە لە بیرکاری کە تیایدا ئەفلاتۆن و بیرکردنەوەی ئەفلاتۆنیانە گەورەیی خۆیان پاراست.) بەڵام گرنگ تر لە هەموو ئەمانە ئەرستۆ بە بونیادی لۆژیك دەژمێردرێت.

کاتێك کە بۆیەکەمین جار زانستی مرۆیی سەردەمەکەی خۆی لە چەند کۆمەڵێکی جیاوازدا دابەش کرد، ئەو توانایەی بە ئێمە بەخشی بۆ تێگەشتنمان لە جیهان بە شێوەی یاساو ڕێکخراو پەروەردەکردن بێت. بەڵام لەسەدەکانی کۆتایدا زانستی ئێمە تاکو ئەو شوێنە فراوان بوو کە ئەم دابەشکردنە بۆ چەند چینێك گۆڕا بە ڕێگرێکی تەواو لەسەر ڕێگەی پێشکەوتنی زانست. پێشکەوتنی زانست لەم جۆرە ڕێساو یاسایانەی بیرکردنەوە تەنها لە ڕێگاکانی پێشوی دیاری کراودا جێ بەجێ دەکرا. ئەو

ڕێگایانەی کە زۆرێکیان لەگەڵ مەترسی لەناوچوون و وون بوونی پلە بەپلە ڕووبەڕوو بوون. ئاڕاستەیەك لە ڕەگ و ڕیشە جیاواز جێگەی مەبەست بوو. ئەنجامی ئەم ئاڕاستەیە ، فەزای هاوچەرخی زانستی نوێیە.

ئەو واقیعیەتەی کە زیاد لە (٢٠) بیست سەدە درێژەی کێشا تاکو ئێمە لە بیرکردنەوەی ئەرستۆدا پەی بەم شتە سنووردارانە بەرین، تەنها پیشاندەری داهێنان و داهێنانکاری بیۆێنەی ئەرستۆیە. بەم حاڵەوە کەتەنانەت شتەشاراوەکانی بیرکردنەوەی ئەرستۆیی، کۆمەڵێ پرسیاری زۆرو بەڵگە نەویستی تێدا بەرهەم هاتووە. هەندێك شتی سنورداری دیکە لەم ڕووەوە بوونیان هەیە کە هێشتاش ئێمە دەبێت لەبەردەمیاندا بوەستین.؟ کەموکورتیەکان لەم ڕووەوە لە شێوەی بیرکردنەوەی ئێمەدا تاکو چ ڕادەیەك ترسناکن؟ ئەم شتە سنوردارو کەم و کورتانە بەتەواوی ئێمە لە زانینی چ شتێك دووبارە دەهێڵنەوە؟

## ساتێک لەگەڵ ئەرستۆ

**ژیان و بەرهەمی ئەرستۆ:**

لە بەرزایەکانی لادێی ئیستاگیر کە دەکەوێتە باکووری یۆنان، لەسەر رووی بەردێکی بەرز، پەیکەرێکی نوێ و تاڕادەیەك بێ رۆح کە ئەرستۆیە دانراوە. روخساری بێتاقەتی بە کۆمەڵێك گردی نارێك و داپۆشراو بە درەخت دەردەکەون کە تاکو ماوەیەکی دوور بەرەو لای دەریای شینی ئیجە درێژبوونەتەوە. پەیکەری تەواو سپی و مەڕمەڕینی ئەرستۆ کە لە ژێر خۆردا تاڕادەیەك دەدرەوشێتەوە، پێڵوی لە پێداو توگایێك[1] یەخەکراوەی لەبەردایە و لە دەستی چەپیدایە نامەیەکی بەدەستەوە گرتووە کە کەمێك لێوارەکانی دڕاون.

(دەڵێن ئەم پەیکەرە مامۆستایەکی فەلسەفەی خەڵکی ئەرجەنتین دروستی کردووە.)لەسەر رووی پایەی پەیکەرەکە دەستەواژەی ( ئەرستۆی ئەستاگیرایی ) هەڵکۆڵراوە. ئەرستۆ لە ئەستاگیر لە دایك بووە بەڵام بەهۆی شوێنی پەیکەری ناوبراو دێی ئەمڕۆی ئەستاگیر شوێنی ڕاستەقینەی لە دایك بوونی ئەو نیە. بەو جۆرەی کە کتێبی رێنموونی

---

١. توگا: جلێکی فراوانە کە پیاوانی رۆمی کۆن لەبەریان کردووە.(م.ن)

(شوێندا) هاتووه، شوێنی له دایك بوونی ئەرستۆ دێی ئەستاگیری کۆنه که له هەمان دەورو بەردایه و شوێنه وێران بووەکانی ئێستاش دەتوانرێت ببینرێن. پاش بینینی ئەو پەیکەرەی که باسکراو توشی پەژارەی کردم، بۆ دۆزینەوەو دیتنی شوێنه کاول و روخاوەکان به رێکەوتم. باتمانێکی[2] تازه لاو که له قوتابخانەوه بۆ ماڵ دەگەڕایەوه پێی وتم: ئەم شوێنه رووخاو وێرانانه جێگەکەیان له خوار جادەوەیه، ئەو به جوڵەیەك به کراسه فراوانه رەشەکەی جادەکەی پیشاندام که بەرەو لای دەریا دەڕۆیشت.

بەپێ بەرەوخواری جادەی درێژو پڕ له پێچاو پێچ بەڕێکەوتم. له گەرمادا گێژبووبووم دەنگی هەوره بروسکەی ترسناك بەسەر بەردەکاندا و بەرزیەکانی دەوروبەریدا بەر گوێم دەکەوت. پاش ئەوەی کاتژمێرێك بەم شێوەیه تێپەڕی سەرەنجام سەیارەیەك له بەردەممدا وەستا. منی گەیاندە ئەستەرتونی، ئەستەرتونی شوێنێکی ترسناکه که شوێنێکی پشودانی فەرامۆشکراوه له لادێیەکی کانزایی دا ناونیشانی ئەستاگیرای کۆنم له دارتاشێك وەرگرت وتی: کەمێك سەرووتر لەجادەی کۆنەوه.

هەر زوو بۆم دەرکەوت که لەمانگی ئۆکتۆبەردا سەیارەیەکی کەم لەم جادەیەوه تێدەپەڕن و هەروەها ئەو کاتەی بارگیرەکانی ئەو ناوچەیە کاتێك که دەگەن رەنگه خێرابن. کاتژمێرێك له ژێر کەنارێکی باریکی

---

٢. باتمان: مەبەست له نوسەر، لاوێکه وەکو تەقلیدی قارەمانەکانی فیلمی باتمان"Batman" خۆی وەك خستبووه سەر شێوەی شەمشەمه کوێره.

بەردێکدا خۆم پەنا دابوو لەکاتێکدا لافاو ئاسا بەسەر دامێنی رووتی گردەکان بە گوڕم دەڕژا. نە هێماو نیشانەیەك لە وێرانەکان بەرچاو دەکەوت و نە هۆکارێکی گواستنەوە لە لابەلای ئەم هەورە بروسکە و بارانە زۆرەدا لە دەورو بەرم پەیدا دەبوو. من ئیدی کە سەراپا خوسابووم لەبەرخاتری پەیکەری ئەرستۆ کە منی بۆ ئەستاگیر ئەستاگیرای درۆزن راکێشابوو قسەم بەخۆم دەوت. جگە لەبەفریودان شتێکی دیکە لەئارادا نەبوو. دێی ئەمڕۆی ئەستاگیر، بەلەبەرچاوگرتنی لە تێکچوونی ناوێك بە هیچ جۆرێك شایستەی ئەوە نیە کە بەجێگەی لە دایك بوونی ئەرستۆ بژمێردرێت. کە ئەگەر جگە لەمە بوایە، هەر لەسەر ئەم پێوەرە دەتوانرێت پەیکەرێك لە (ژاندارك) یش لە شاری نیوئور لینس دروست بکرێت[٣]...

ئەرستۆ لەساڵی ٣٨٤پ.ز لە ئەستاگیرای کۆن لە شارەکانی مەقدۆنیای یۆنان هاتۆتە دونیاوە. یۆنانیە کۆنەکان لە سەدەی چوارەمی پێش زایین بەو چاوەوە سەیری مەقدۆنیەیان دەکرد کە ئەمڕۆ فەرەنسیەکان سەیری بەریتانیاو ئەمریکا دەکەن. بەڵام ئەستاگیر لەدەرەوەی حەوزەی ((شارستانیەت)) دا نەبوو. ئەم شارە کۆچەرێکی

---

٣ناوی شارێکە لە قاڕەی ئەمریکا، بە سەرەنج دان لەوەی ژاندارك قەدیس و New oreleaus قارەمانی فەرەنسی (١٤٣١-١٤١٢)سەربازەکانی بەریتانیای ناچارکرد کەبەدەورەدانی شاری ئورلئان Oreaus کۆتایی پێ بهێنن. مەبەستی نوسەر ئەوەیە کە ناتوانرێتبەرمەبنای لێکچوونی ناوی ئەم دووشارە، پەیکەری ژاندارك لەشاری نیوئورلیز بەرپا بکرێت. م.ن

بچووکی یۆنانی لە جەزیرەی ئاندروس کە دەکەوێتە دەریای ئیجەوە درووستی کردووە.

باوکی ئەرستۆ کە ناوی نیکوماخوس بوو، پزیشکی تایبەتی ئامونتاس و پاشای مەقدۆنی و باپیری ئەسکەندەری گەورە بوو. بەهۆی ئەم پەیوەندیە دۆستێکی نزیك ئەم دوانەی پەروەردەکرد. باوکی ئەرستۆ وەك دەرکەوتووە سامانێکی زۆری کۆکردۆتەوەو بوبە خاوەنی بەشێکی فراوان لە دەورەبەری ئەستاگیرو دەوروبەری یۆنان.

ئەرستۆی لەحاڵ و هەوای زانستی پزیشکی پەروەردەبوو. هێشتا لاوێك زیاتر نەبوو کە باوکی لە دەستدا. پاش مەرگی باوکی ئەرستۆیان برد بەرەو شارێکی یۆنان بەناوی"ئاتارنوس"کە دەکەوێتە کەناری رۆژئاوای ئاسیای بچووك و لەوێ لەلای کورێکی مامی بەناوی پروکنسوس پەروەردەبوو.

ئەرستۆ وەك زۆرێك لەتاکەکان کە دەبنە خاوەنی ماڵو سامانی زۆر رووی لە خەرجکردنی زۆرو بێمانا کرد. دەگێڕنەوە هەموو ئەو ماڵ و سامانەی بۆی بە جێمابوو. لە خۆشی خواردن و خۆش گوزەرانیدا خەرجی کرد. و لەکۆتایدا بە جۆرێك بێ پارە مایەوە کە بۆ تێپەڕاندنی کاروبارەکانی ناچار بوو ماوەیەك بڕوات بۆ سەربازی پاشان گەڕایەوە بۆ ئەستاگیراو لەوێ دەستی بە خوێندنی پزیشکی کرد. سی ساڵ بوو کەوازی لە پزیشکی هێناو ئەمجارە بەرەو ئاتن رۆشت بۆماوەی هەشت ساڵ لە ئاکادیمیادا لە ژێر چاودێری ئەفلاتۆندا دەستی بە خوێندن کرد. پاشتر ئەو کەسانەی رافەی حاڵی ئەرستۆیان دەکرد لە سەدەکانی

ناوەڕاستی ئەورووپادا و مەبەستیان بوو شێوەو رووخسارێکی شێوە قەدیس لە ئەرستۆ وێنا بکەن، حەزیان دەکرد ئەم شتە هەڵبەستراوانەی کەباوەڕیان پێناکرێت لەبەرچاو نەگرن یاخود بەشتانی زیادەیان بزانن. گێڕانەوەی دیکەش سەبارەت بە ساڵەکانی تەمەنی لاوی ئەرستۆ بوونی هەیە، بە پێی ئەم گێڕانەوە بێتاقەتکەرە (بەلام، لەڕاستیدا جێگەی باوەڕپێکردنی زیاترە) ئەرستۆ لە حەقدە ساڵیدا راستەوخۆ چووە ناو ئەکادیمیاوە. بەم حاڵەشەوە تەنانەت هەندێك لەسەرچاوەکانی ئەم گێڕانەوەیەش ئاماژە بە قۆناغێکی کورت لە خۆشگوزەرانی ئەرستۆ دەکەن.

لەهەر بارێکدا هێشتا ماوەیەکی کەم لە رۆشتنی ئەرستۆ بۆ ئەکادیمیا تێنەپەڕی بوو، کەبەگرنگی و جدیەوە قۆناغی خوێندن و خوێندنەوەی گرتەبەر و بە خێرایی خۆی لە پلەی وردترین هزروان و بیرمەندی وەچەی خۆی جێگیر کرد. کەچی هێشتا ئەرستۆ قوتابیەك زیاتر هیچی دی نەبوو؛ وا پێدەچێت کە ئەرستۆ لەسەرەتای کاردا، سەراپا پەرستانی موریدی ئەفلاتۆن بوو بێت. بە شێوەیەکی تەواو ەو هەموو فێرکاریەکانی ئەفلاتۆن کە لە ئەکادیمیادا دەخوێنران وەریگرتن و لەبەریکردن و فەلسەفەکەشی لەسەراپای بنەماکانیدا بە شێوەیەکی بەهێز دامەزرا.

بەلام بیرو هۆش و زیرەکی ئەرستۆ زیاتر لەوەبوو کەبە تەواوی بەشوێن کەسێکەوە بێت- تەنانەت ئەگەر ئەوکەسە ئەفلاتۆنیش بوایە. کاتێك کە ئەرستۆ بەبۆچوونی خۆی شتێکی بە دژیەك (یان خوانەکردە، ناتەواو) لە بەرهەمەکانی مامۆستاکەی ببینیایە، ئەوە دیاری دەکرد، بە

حوکمی ئەو وەزیفەی ئەقلانیەی کە هەیبوو هەستی دەکرد کە دەبێت بیلێت. ئەم خوەی ئەرستۆ پلە بەپلە بووە هۆی ناڕەحەتی مامۆستاکەی، ئەگەر چی هیچ کات بە گفتوگۆی زارەکیەوە خەریك نەبوون، بەلآم دیاردەو شتە دەرکەوتووەکان پشتگیری ئەوەن کە پلە بەپلە ئەم دوو کەسە لە پلەی گەورەترین بیرمەندان و بیرکەرەوانی رۆژگارەکەیان وایان بە باش زانی کە شتە تایبەتیەکانی خۆیان و دووریان لە نێوان خۆیاندا رەچاو بکەن. بەو جۆرەی کەبەناوبانگە، ئەفلاتۆن بە ناونیشانی ((مێشکێك لەسەر دووپێ)) باسی ئەرستۆی دەکرد و جێگەو پایەی بە((ماڵی خوێندنەوە)) ناودەبرد. ئەم ناوە بۆ گەنجینە بەناوبانگەکانی دەستنووسە کۆنەکان ئاماژەی پێکراوە کە ئەرستۆ لە ماڵەکەیدا پارێزگاری لێکردوون. ئەرستۆ عادەتی وابوو نوسخە دەست نوسە دەگمەن و کەمەکان لەبەرهەمەکانی کۆندا بەهەر ئەندازەیەك کە دەستی دەکوتن دەیکڕین لە یەکەمین کەسەکانی خەڵکی شار بوو بەبێ پلەو پایەیەك دەژمێردرا کە خاوەنی کتێبخانەی تاکەکەسی تایبەتی خۆی بوو.وادەرکەوتووە ئەم لێکۆڵەرەو لاوە پڕ لە زانست و زانیاریە ناوبانگی پەیدا کردوو زۆری نەخایاند کە لە ئاتن دا بەهۆی رەفتارە دەگمەنی لێهاتووی و شێوەی ژیانی مەزنی (هەرچەندە تارادەیەك سەربەرزانەو گەورانە)بوویە سەر زمانی خەڵکی. لە گێڕانەوەکاندا هاتووە کە ئەندامی لاوازو پێ درێژو باریکی هەبووەو زمانی کەمێك گیرانی تێدا بووە. رەنگە بۆ پڕکردنەوەی ئەم (ناتەواویە روکەشیانە) بوو بێت کە زۆر جوان و کەشخە جلی دەپۆشی و نوێترین مۆدێلەکانی جلوبەرگی لەبەر دەکرد،

هەروەها پەنجەکانی بەچەند ئەڵقەیەك رازێنرابوونەوە جوانی دەکردن. تەنانەت ئەفلاتۆن کە خۆیشی کتێبی زۆری هەبوو بەلام حەسوودی بە کتێبخانەی ئەرستۆ دەبرد.

بەم حاڵەوە بەهۆی ئەم شێوە ژیانەوە کە خۆش و لەگەڵ ئەوەشدا لێهاتوویی و بلیمەتی تێدا بوو، نوسینە یەکەمینەکانی ئەرستۆ (کە ئێستا ئیدی لە ناوچوون) هەمیشە ئەو گفتوگۆیانە بوون سەبارەت بە بێهوودەیی بوون لە (دونیا) و ستایشی چێژەکانی دوارۆژی دەکرد.

ئەرستۆ لێکۆڵینەوەی کرداری و زانستی ئەنجامدەدا. ئەم کارەش ئەو توانایەی پێبەخشی تاکو لەبۆچوونەکانی ئەفلاتۆن لە تێڕوانینێکەوەکە بەشێوەیەکی رۆژ لە دوای رۆژ واقیع بینانە. بڕوانێت. ئەفلاتۆن باوەڕی وابوو کە ئەم جیهانە، جیهانی کارو بارە بەش(جزء)یەکان تێیداین و دەرکی پێدەکەین تەنها لەشێوە دیاردەکان یاخود نموونەکان و حەقیقەتی کۆتایی و تەواو لەجیهانی دیکەدا، واتە لە جیهانی ئایدیاکان جێگەی هەیە، کە هاوشێوەی وێنە یاخود نموونەی نموونەین. شتە بەشیە (جزء)یە جیهانیەکان کە دەرکیان دەکەین، واقیعیەتی خۆیان تەنها لە رێڕەوی بەهرەمەندی لەم جیهانە ئایدیا دەگمەنەکان بەدەست دەهێنن. لەبەر ئەوە پشیلەیەکی تایبەت وەکو پشیلەیەکی رەش کە دەبینین لەسەر کورسیەك پاڵ کەوتووە، تەنها لەو رووەوە پشیلەیەکە کە لە ئایدیا (یاخود نموونە)ی بنەڕەتی پشیلەبوون یاخوود پشیلەیی بوون بەهرەمەند بووە، وە لەم رووەوەشەوە پشیلە رەشەکە لە ئایدیا (یا

نموونە)ی رەشی بەهرەمەند بووە. تاقانە واقیعیەتی لە پشت جیهانی هەست پێکراو، لە هەرێمی بونیادی ئایدیاکان دا بوونی هەیە.

لە کاتێکدا کە رووگەی ئەفلاتۆن بۆ جیهان لە بنەڕەتدا ئایینی بوو، بەڵام روگەی ئەرستۆ زیاتر رەنگێکی زانستی هەبوو. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەرستۆ حەزی بەوەرگرتنی ئەندێشەی ناواقیعی بوونی جیهانی دەوروبەرمان لە خۆی پیشان نەدات. بەم حاڵەوە ئەرستۆش دابەشکردنی شتەکانی بەپێی دووشت دابەش دەکرد،ئەوانیش. ناوەرۆکە (جوهر) یەکەمینەکان و ناوەرۆکە (جوهر) دووەمینەکان. بەم جیاوازیە کە لەلای ئەرستۆ جەوهەرە یەکەمینەکان، شتە بەش بەشەکانی جیهان و ناوەرۆکە دووەمینەکان ئایدیا یاخود وێنە بوون. ئەرستۆ لە سەرەتادا دوودڵ بوو کە کام یەك لەم دوو دەستە ناوەرۆکە (جوهر) بە واقیع، حەقیقەتی کۆتایین و ئەمەش تاکو سنورێك بەبەڵگەی پاراستنی حورمەتی ئەفلاتۆن بوو. (هەرچی بێت پێش هەمووان مامۆستای پیری ئەم چەمکانە لە بیرەوەریدا بوون.) بەڵام وردە وردە ئەرستۆ زیاتر دڵنیایی بەدەست هێنا کە لە دونیای واقیعدا دەژی و لە دیدگای ئەفلاتۆن دورکەوتەوە.

به تێپەڕبوونی ساڵەکان ئەرستۆ بە کردار فەلسەفەی ئەفلاتۆنی باس دەکرد. بەم حاڵەوە تێۆرەکانی ئەودیو سروشتی ئەوبە ئاشکرا بۆچوونەکانی لە بۆچوونەکانی ئەفلاتۆنەوە وەرگرتووە. لە کاتێکدا کە لە دیدی ئەفلاتۆنەوە، وێنەی ئەو ئایدیایانە بوون کە بوونێکی سەربەخۆیان (لە جیهانی ئێمە) دا هەبووە، ئەرستۆ، وێنە ( یاخود بەو جۆرەی کە خۆی ناوی شتە گشتیەکان (کلیات)ی لێناون زیاتر بە شێوەی بەشی

کۆبووەوەلە جەوهەرەکانی جیهانی دەردەبڕی بە بوونێکی سەربەخۆ بۆیان ڕازی نەبوو. ئەرستۆ ژمارەیەك بەڵگەی بنەڕەتی لە وەڵامی تیۆری ئایدیاکانی ئەفلاتۆن دەربڕی، بەڵام وادەردەکەوێت سەرەنجی لەوەنەدابوو کە ئەم ڕەخنانە بەهەمان پلە بونیادی تیۆری گشتی خودی خۆیشی دەبن. بەم شێوەیە وادەرنەکەوتووە کەسێکی ترسەرنجی لەمەدابێت.لە ئەنجامدا تیۆرەکانی ئەفلاتۆن بەزۆری لەقاڵبی فێرکاریە ڕێکخراو ڕاستەکانی ئەرستۆ بە شێوەی فەلسەفەی زاڵی جیهان لە سەدەکانی ناوەڕاست دەرکەوتن.

لەبەختی باش لە نووسینەکانی ئەرستۆ خاڵی نەزانراو دژیەکی ئاشکرای فراوان دەدۆزێتەوە کە ئەمە خودی دەست مایەیەکە بۆ باس و گفتوگۆی (مناقشه)ی بێپایان لە بەردەم بیرمەندان و هزروانانی سەدەکانی ناوەڕاست.باس و گفتوگۆیەك لەتەفسیرە جیاوازەکانەوە دروست دەبوون. هەرئەم گفتوگۆیانە لەسەر هەڵەکان و داهێنراوەکان و باوەڕەنادروستەکان کە کۆمەڵ و لایەنی جیاوازیان دروست دەکرد هەروەها ڕاڤەی نادروستی شەیتانی بوو کە چەمکی فەلسەفەی بەزیندوویی هێشتەوە، ئەوەش لەکاتێکدا بوو کە هەموو کاروبارێکی فەلسەفە بەکردار پاشەکشەی کردبوو. هەندێك باوەڕیان وایە هەندێك لەم گفتوگۆیانە بەهۆی هەڵەسادەکانی نوسەرانی سەدەکانی ناوەڕاست بووە. ئەم هەڵانەش بەشوێن ئەوەوە ڕوویان دەدا کە دەست نوسی نوسەرانی سەدەکانی ناوەڕاست لەسەر ڕێڕەوی ڕوداو گومان، وشەی دیکەیان لە جێگەی زاراوە

لێڵ و ناروونەکان دادەنا لە سەرچاوە بنەڕەتیەکاندا کە کتێبی گەنیوبوون لە لایەن کرمەکانەوە خورابوون.

ئەفلاتۆن لە ساڵی ٣٤٧پ.ز مردو جێگەی سەرۆکی ئەکادیمیا خاڵی بوو. شەش کەس لە شایستە ترین هاوکارانی ئەفلاتۆن بەو ئەنجامە گەیشتن کە تەنها کەسێك هەیە کە شایەنی ئەوەیە ببێتە خاوەنی ئەم جێگەیە و ئەم پلەو پایە وەربگرێت. بەداخەوە هەریەك لەشەش کەسە کەسێکی جیاواز لە مێشکیدا بوو (کە زۆرجار خودی خۆیان بوون.) سەرئەنجام "ئەسپوسیپوس" کوڕەمامی ئەفلاتۆن گەیشتە ئەم پلەوپایەیە و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەرستۆ زۆر بێزار بێت. بەجۆرەی کە بەناوبانگە، "ئەسپوسیپوس" زۆر توند مامەڵەبوو، تاکو جێگایەك کە رۆژێکیان سەگەکەی خۆی بە تاوانی پاسەوانی کردنی لەکاتی وانە وتنەوەدا خستیە نێو چاڵێکی ئاوەوە. پاش ئەوە کە بویە جێگەی نارازی بوونی خەڵکی سەرئەنجام ئاسانکاری مردنی بۆ خودی خۆی فەراهەم کرد. "ئەسپوسیپوس" بەهیچ جۆرێك لە رووی فیکریەوە دژی ئەفلاتۆن نەبوو. ئەفلاتۆنێك کە فێرکاریەکانی بوونە ژێر مەبنای هەرجۆرە بیرکردنەوەیەکی عەقلی و هزری دووهەزاری دواتر. کاتێك کە ئەسپوسیپوس بەر پرسیارێتی و پلەی ئەکادیمی لە ئەستۆ کرا، ئەرستۆ بەسەختی و تاڵیەوە کاتەکانی بەڕێ دەکردن تاکو ئاتنی بە جێهێشت و لەم سەفەرەیدا دۆستی "کسنوکراتس" (کە ئەویش هاوڕێی دڵشکاوی سەرۆکایەتی ئەکادیمیا بوو) لەگەڵیدا هاوڕێ بوو.

ئەرستۆ بەکەشتی لە دەریای ئیجەوە تێپەڕی و ڕۆیشت بۆ "ئاتار نئوس" کە سەردەمی لاوی لەوێ تێپەڕاندبوو. سەرۆکی شاری "ئاتار نئوس" لەو کاتەدا خواجەیەك بوو بەناوی "هێرمیاس". کابرایەکی یۆنانی کە سەرکەوتوو بوو بوو ئەم گۆشەیە لە ئاسیای بچوك بخاتە ژێر دەستی خۆیەوەو دەستی بەسەردا بگرێت. "هێرمیاس" زۆر بەتوندی کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەوەی کەلە ئەکادیمیادا دەخوێنراو کاتێك کە ئەرستۆ ڕۆیشت بۆ "ئاتارنئوس"بە باوەشێکی کراوەوە بەرەو پێشوازی کردنی ڕۆیشت. "هێرمیاس" سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئاتارنئوس بکاتە ناوەندێك کە ببێتە هۆی بلاوکردنەوەی فەرهەنگی یۆنانی و ئەرستۆ دەستی بەکارکردن کرد تاکو سەبارەت بە باشترین ڕێگە بۆ گرتنە بەری ئەم کارە ڕێنمایی خواجە هێرمیاس بکات. فەلسەفەی سیاسی ئەرستۆ بە زۆری لەسەر لێکۆڵینەوە لە ڕژێمە جۆراو جۆرە حوکمیەکان بوو، هەروەها باسی ئەوەش کە ئێستا چۆن دەتوانرێت بە باشترین شێوە بەکار بهێنرێن و دروست بکرێن، تێگەیشتنی ئەرستۆ لە سیاسەت قوڵ بوو. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بە تەواوی بە پێچەوانەی ئەفلاتونەوە کە ڕووگەیەکی ئامانج خوازانەی بۆ سیاسەت هەبوو، دیدگایەکی بەرژەوەندی خوازانە یاخود کردار ویستانە بگرێتە بەر. ئەفلاتۆن لە کتێبی "کۆمار"دا ئەوەی ڕوون کردبویەوە کە چۆن فەیلەسوف– سەرۆکی شار دەبێت بەسەر شاری یۆتۆپی و خەیاڵی (مدینە فازیلە) کەیدا (کە وەکو هەر سەرۆکێکی دیکەی شار لەڕاستیدا جگە لە حوکمەتی ستەمکاری شتێکی دیکە نەبوو.) فەرمانڕەوایی بکات. بەڵام ئەرستۆ بە پێچەوانەوە ئەوەی ڕوون دەکردەوە

کە حوکمەتی واقیعی یاخود کرداری چۆن کاردەکات و لەم زەمینەیەدا هێڵی گشتی رێگە کاریگەرەکانی کارکردنی کەم تا زۆر، زۆربەیان بەسەر ( فەلسەفەی سیاسی) میکاڤیلی پێش دەکەون، وێنای دەکرد.

ئەرستۆ بەچاکی لەگەڵ سیاسەتدا ئاشنا بوو، ئەوەشی دەزانی کە دەبێت سیاسەت لەبنەڕەتدا سوودێکی هەبێت. ئەم داواکاریەش بەو مانایە نیە کە ئەو لە هەر جۆرە ئامانج ویستێنێك خاڵی بێت و ئامانج خواز نەبێت. بە گشتی باوەڕی ئەرستۆ ئەوە بوو کە ئامانجی حوکومەت پەروەردەکردن و پاراستنی توێژێکە لە مرۆڤە بەڕێزو خاوەن رۆشنبیریەکانی وەکو خۆی ، هەر ئەم واقیعیەتەی قبوڵ دەکرد کە شتێکی لەم جۆرە هەمیشە جێبەجێ ناکرێت. بۆ نموونە:- بۆ بەڕێوەبردنی ئیدارەیەکی تاڕادەیەکی سەرکەوتووی حکومەتێکی ستەمکار، دەبێت فەرمانڕەوای ئەو حکومەتە وەکو کەسێکی ستەمکار بجوڵێتەوە. لەم حکومەتە پۆلیسیەدا جێگەیەك بۆ هەڵکەوتوان و کەسانی بلیمەت، جێگەی سەرنجی ئەرستۆ نیەو هیچ پلەیەکیان نیە. هەرچەندە رێگەیەکی دیکەش بۆ بەڕێوەبردنی یاسای ستەمکاری بوونی هەیە، تاکی ستەمکار دەتوانێت دەمامکی مەزهەبی و شێوەی مەزهەبی لە خۆی پیشان بدات و سیاسەتێکی مام ناوەند هەڵبژێرێت.

هەندێك باوەریان وایە کە رەنگە ئەرستۆ لەکاتی فێربووندا، هرمیاسی ستەمکار هەر ئەم رێرەوە مام ناوەندیەی هەڵبژاردبێت. بە بۆچوونی من ئەم بۆچونە دوورە. هەڵبەتە مەبەستی من ئەوە نیە کە ئەرستۆ رێگەی پێشنیاری خۆی بۆ پاراستنی کیانی حوکومەتی ستەمکاری تەواو

ڕاگەیاندبێت، ئەو ڕێگایانەی کە ڕاڤەکردنی بە درێژی هێناوە و خوێندنەوەیان موو لە ئەندامانی مرۆڤ ڕاست دەکاتەوە. لە بۆچونی ئەرستۆدا ئەگەر ئێوە بتانەوێت بە چاکی لە بەڕێوەبردنی ئیدارەی یاسای ستەمکاری دەربچن، پێویستە ئەوە بە مستەکۆڵەی ئاسنین بەڕێوە بەرن. دەبێت هەرجۆرە چالاکیەکی فەرهەنگی کە بیرکردنەوەی ئازادانە بێت، ڕێگری لێبکرێت و دەبوو خەڵکە گشتیەکە لە ترس و ترسناکی و هەژاری و دەستکورتیدا بژین و بۆ دروستکردنی بیناگەورەو مەزنە گشتیەکان بەکاربهێنرێن. دەبێت خەڵکیش جاروبار بخرێتە ڕێگە بۆ بەرکانێی شەڕ تاکو هەمیشە گوێ چاوەڕوان بمێنێتەوەو نیازو مەبەستەکانیان و پێویستیەکانیان پتەو بەڕێوە بەرێت و فەرمانڕەوا پارێزراو بێت.

ئەرستۆ لە ساڵەکانی دواتردا گۆڕانی لە فەلسەفەی سیاسی خۆیدا کردوو فراوانی کرد. ڕەنگە ئەوکاتەی کە مامۆستای هرمیاس بووە پابەندبووبێت بە بۆچونەکانی ئەفلاتۆن لە "کۆمار"دا ئەگەر ئەم گومانە ڕاست بێت، ڕەنگە ئەرستۆ فێرکاری فەیلەسوف- سەرۆکی شاری ئەفلاتۆنی بە شێوەیەك کەبیری لێکردۆتەوە، ڕێکخستن و چاککردنی تێدا ئەنجام دابێت. پێویست نەبوو فەرمانڕەوای ستەمکار خواجەیەکی (وەکو هرمیاس) ببێتە فەیلەسوف. لە ئەنجامدا ئەو تەنها دەبوو لە پەندو ڕاوێژکاری فەیلەسوفێك پەیڕەوی دەکات.

**ئەرستۆ ئیدی بەرەو قۆناغی ناوەڕاستی تەمەنی نزیك دەبویەوە و لە پۆلی مرۆڤە وشك و جدیەکان دەیانژمارد. ئەو کات ئەرستۆ بۆ بێناگاکردنی هەموو ئەو کەسانەی کە دەیان ناسی عاشق بوو.**

خۆشەویستی کچێکی لاو بوو بەناوی پویتاس. بەو جۆرەی کە بەناوبانگە ئەم کچە ئەندامێکی خێزانی هێرمیاس بوو. هەندێك باوەڕیان وایە کە پویتاس خوشکی هرمیاس بووەو هەندێکی تر ئەو بەنزیکی دادەنێن. کۆمەڵێکی دیکە لە سەرچاوەکان کە زۆرجار کە شایستەی ئەوەن پشتیان پێ ببەسترێت. دەڵێن لە بنەڕەتدا ئەم کچە خۆشەویستی هرمیاس بووە. (بە لەبەرچاوگرتنی دۆخی رەگەزی هرمیاس، بە خۆشەویستێکی تەشریفاتی دەژمێرێت.) ئەم قسانە دژو پێچەوانەی ئەم گریمانەیە بە هێز دەکەن کە ئەو خۆشەویستێکی دەرباری فەرمانڕەوا بوو. ئایا ئەم یەکەمین دڵ وابەستەیی بوونەی مامۆستای بە شەوق و تاسە بە فریشتەی ئاوی خۆی بووە؟ ئەرستۆ عادەتی وابووە ئەزموونە سنوردارەکانی خۆی تاڕادەیەك بەسەر هەمووواندا بسەپێنێت. لە نوسینەکانی خۆیدا سەبارەت بە ژن و مێردایەتی بانگەشەی ئەوە دەکات کە گونجاوترین تەمەنی هاوسەرگیری بۆ پیاو(٣٧)ساڵ بۆ ژنیش (١٨) ساڵە کە ئەم دوو تەمەنەش کت و مت هەمان تەمەنی ئەرستۆو پویتاسە لە کاتی هاوسەرگیریاندا. هەرچەندە رەنگە ئەرستۆ بەهرەی لە هۆش و بیر وەرگرتبێت، بەڵام خەیاڵ هەمیشە لەتایبەتمەندیە دیارەکانی کەسێتی ئەو نەبووە.

ئەمەش لە تەنزەکانی رۆژگارە کە ئەرستۆ لە نووسینی شاعیرانە دا لە کتێبی ((هونەری شیعر)) بە جۆرێك راڤەو تەفسیری سەبارەت ئەدەبیات بە دەستەوە دەدات کە تاکو ئەوکاتە نموونەی نەبووە، لەکاتێدا کە ئەفلاتۆن بە ریزبەندی شاعیر ترین فەیلەسوف بووە، فەرمان بە چالاکی

شاعیران دەدات. (خودا دەزانێت کە ئەفلاتۆن بەم بڕیارەی هەوڵی لە پێناو شاردنەوەی چ شتێکدا بووە.) شیعر لەلای ئەرستۆ نزیکی و فراوانی تێدایە و ئەو باوەڕی وابووە کەبەهای شیعر لە مێژووش زیاترە. چونکە شیعر فەلسەفی ترە. مێژوو تەنها لەگەڵ رووداوە بەش بەشەکان سەرووکاری هەیە، لە حاڵێکدا شیعر زیاتر لە کارو فرمانی گشتیەوە نزیکترە. لێرەدا وا پێدەچێت کە ئەرستۆ رەخنە لە جیهان بینی خۆی دەگرێت و تارادەیەك میهری خۆی بۆ جیهان بینی ئەفلاتۆن پیشان دەدات و پاڵپشتی دەکات. بەڵام بە پێی بۆچونی بەناوبانگ ئەرستۆ بینا لەسەر ئەوەی تراژیدیا (ئەو رووداوانەی کە وێنایان دەکات کە هۆکاری هەژاندن) ((سۆزو ترس لە ئێمەدا دروست دەکەن تاکو بەم رێگەیە ئەم جۆرە سۆزانە کەم ببنەوە)) هەروەها لە پلەی بینایی گرنگ سەبارەت بە ئەزموونی جوڵێنەر بەڵام بابەت دروستکەرو دژوار نمایشی تراژیدی دەمێنێتەوە.

ئەرستۆ کە کەسێتی قوڵ بیرکەرەوەو جدی هەبوو، کاتێك پێی کۆمیدی هاتە ناوەوە لە تێگەشتنی بێ توانا مایەوە. ئەو باوەڕی وابوو کە کۆمیدیا تەقلید کردنی خەڵکانی خاوەن سامانەو پێکەنین شتێك نیە جگە وێنەیەکی بێ دەردەسەر لە ناشیرینی. تەنها جوانناسی دەتوانێت ئەو پەرێشانیەی کە هونەر دەهێنێتە بوون دەوڵەمەند بکات. تیۆردانەرانی کۆمیدیەکان بە هەڵەیەکی خراپ کۆتایی دێت. ئەرستۆش لەم یاسایە بەدەر نیە. لەو شوێنەی کە دەڵێت : (لە هەنگاوی یەکەمدا ((دەبێت بوترێت)) کۆمیدی بە جدی نازمێرێت.)

هێشتا کاتێکی زۆر بەسەر هاوسەرگیری ئەرستۆ تێنەپەڕی بووە کە قوتابخانەیەکی لە ئاسوسدا دامەزراند. سێ ساڵی دواتر بەرەو "موتیلنە" ڕۆشت کە دەکەوێتە جەزیرەی لسبوسەوەو لەوێ قوتابخانەیەکی دیکەی دامەزراند. ئەرستۆ پێش ئەمەش زۆر بە سەختی پەیوەندی لەگەڵ پۆلێنکردنی گیاکان و گیانلەبەرانەوە هەبوو. یەکێك لەو شوێنانەی کە جێگەی پەیوەندی ئەرستۆ بوو بۆ پەیدا کردنی نموونەی ئاژەڵەکان و گیاکان کەناری خەلیجی یرا بوو ئەم شوێنەش کەم تا زۆر بە وشکیش دەورە دراوەو ئێستاش هێشتا ئاوی ئارام و لەسەرخۆی لەبەردەم کێوی ئالپ هەربەهەمان ئەندازەیە خۆشەکە لە ڕۆژگاری ئەرستۆدا بووە. لە وەرزی بەهاردا دامێنی ئەو چیایە بەفەرشی ڕازاوەو نەخشینی ڕەنگاو ڕەنگ گوڵەکان دادەپۆشرێت و لە ڕۆژگاری ئەرستۆدا بە دڵنیاییەوە گورگ و درندەو کەروێشك و بەرازو تەنانەت ورچیش لەم داوێنانەدا ژیاون: یەکەمین بەهەشتی سروشت ناسی بۆ یەکەمین سروشتناس ئەرستۆ لە بەرهەمەکانی خۆیدا سەبارەت بە سروشت بەدوای کەشفکردنی زنجیرەیەك پلەی جۆرەکان و شێوەکانی (گیاکان و ئاژەڵەکان) بووە. بەلآم بارودۆخی زۆری لێکۆڵینەوەکانی لە خۆیدا ونیان کرد. ئەو گەیشتە ئەو باوەڕەی کە سروشت ئامانجدارە و هەریەکە لە تایبەتمەندی ئاژەڵەکان بۆ ئەنجامدانی وەزیفەیەکی تایبەتی بڕکراون. ئەو دەیگوت: ((سروشت کاری بێهودە ئەنجام نادات.)) زیاد لە دووهەزار ساڵ درێژەی کێشا تاکو زانستی ژینگە ناسی توانی هەنگاوێکی واقیعی لە پشت ئەم بۆچونەوە هەڵبگرێت و ئەو هەنگاوەش تیۆری گەشەسەندنی "داروین" بوو.

لەم کاتەدا ئەرستۆ وەکو بیرمەندێکی پێشەنگ و لە سەراسەری یۆنان دەنگی دابۆوە. " فیلپ مەقدۆنی" بە تازەیی یۆنانی رزگار کردبوو سەرکەوتووبوو لەوەی کە دەوڵەت – شارەکانی یۆنان کە لەگەڵ یەکدا نەدەگونجان بۆ یەکەمین جار لەشێوەی دەوڵەتێکدا یەکیان بخات. فیلیپ بانگهێشتی ئەرستۆی کرد تاکو فێرکردنی تایبەتی کوڕە لاوە سەرکەشەکەی لە ئەستۆ بگرێت. هەڵبەتە پێشتر باوکی ئەرستۆ دۆست و پزیشکی تایبەتی باوکی "فیلیپ" بووە. ئەرستۆ بە یەکێك لە ئەندامانی خانەدانی ئەوان دەژمێردرا. بۆیە بە پێویستی زانی لەسەر خۆی ئەم پێشنیرە شاهانەیە قبوڵ بکات. بەرەو لای "پیلا" پایتەختی مەقدۆنیە بەڕێکەوت. ئەمڕۆ پیلا لەکەناری جادەیەکی سەرەکی و پڕ لە چاڵ و چۆڵە کە لە "تسالوینکی" بەرەو سنوری رۆژئاوای یۆنان درێژبۆتەوە و جگە لە زەویەکی پڕ لە بەرد و چەند خشتێکی کۆن و چەند چینە دیوارێك شتێکی دیکە نەماوەتەوە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەم شوێنە یەکەمین پایتەختی یۆنانی کۆنەو پاشتر پاش ئەوەی ئەسکەندەری گەورە هێزی خۆی بۆداگیر کردنی جیهان دەست پێکرد، تەنانەت دەتوانرێت بوترێت یەکەمین و (کۆتاهەمین) پایتەختی جیهانی ئەو رۆژگارە بووە. جێگای سەرسوڕمانە کە ئەم ناوچەیە لە سەرنج راکێشان و جێگای سەرنج بێ بەهرە بووە.

**لەم شوێنەدا لە ساڵی "٣٤٣"پ.ز یەکێك لە مەزنترین بیرمەندان کە جیهان تاکو ئێستا بە خۆیەوە بینیویەتی پەروەردەو فێرکردنی یەکێك لەگەورەترین دێوانەی خۆبەگەورەزانەکانی ئەستۆ گرتوە کە تاکو ئێستا**

لە جیهان بەخۆیەوە بینیوە. ئەرستۆ "٤٢" ساڵ بوو، بەڵام ئەسکەندەر تەنها لاوێکی "١٣" ساڵ بوو. بەڵام سەرسوڕمانی ناوێت کە بزانین ئەم ئەسکەندەرە بوو کە سەرئەنجام ئەرستۆی بە ئاسانی ئەم منداڵە کەللە سەختە لە ماوەی سێ ساڵدا کە شاگردو هاوڕێیانی ئەرستۆ بوو تەنانەت وشەیەکیشی لە مامۆستای تایبەتی خۆی فێرنەبوو. بەهەرحاڵ ئەمە شتێکە لە گێڕانەوەکاندا هاتووە. ئەرستۆ باوەڕی وابوو کە یۆنانیەکان لە هەموو نەژادەکان بەرزترو گەورەترن. لە بۆچونی ئەودا باشترین فەرمان ڕەواو ڕێبەر، قارەمانی هومری، وەکو ئاشیلە کە حیکمەت و ژیری لە پاشماوەی کۆتا پێشکەوتنەکانی شارستانیەتی یۆنانی تێربووبێت، هەروەها ئەرستۆ باوەڕی وابوو کە لە ویژدانی مرۆڤدا توانای خستنە ژێردەستی هەموو جیهان شاردراوەتەوە. ناتوانرێت ئینکاری لەوە بکرێت کە کەسێتی ئەسکەندەر لێکچوونێکی سەیری لەگەڵ ئەم تەرحەی ئەرستۆدا هەیە. تەنانەت ئەگەر ئەوە قبوڵ بکەین کە لەکۆتایدا، ئەسکەندەر بەتەواوی ئەو شتە نەبوو کە ئەرستۆ دەیویست. بەهەرحاڵ ئێمە ئەمڕۆ دەتوانین لەسەر ڕێگەی ڕووداو گومان سەبارەت بە کاریگەری مێشکی ئەم دووکەسە بەرامبەر بەیەکتر بۆچوونمان دەربڕین، چونکە بەتەواوی سەرسوڕمانەوە سەبارەت بەوشتە کەمێك دەزانین.

ئەوەی کە دیاریکراوە ئەوەیە ئەرستۆ لەماوەی خزمەتەکانیدا داوای لە فیلیپ کرد شوێنی لەدایك بوونی، واتە شاری "ئەستاگیرا" نوێ بکاتەوە، شارێك کە لە یەکێك لە شەڕەکان کۆتایی "فیلیپ"دا لە جەزیرەی "هالکیدیکی" لەگەڵ خاکدا یەکسان بوو بوو. چەند

بەڵگەیەکیش لەبەردەستدان کە ئەسکەندەر لەکاتی لەشکر کێشی گەورەی خۆی بۆ فراوانکردنی دەستەڵاتی، گیای نەناسراوی جۆراو جۆری ئاژەڵی دڕەندەو ئاژەڵی دەگمەن و دەستەمۆ نەکراوی بۆ مامۆستا پیرەکەی بە دیاری دەنارد تاکو پۆلێنیان بکات. زانستی باخداری و پەروەردەکردنی گوڵ سەرچاوەکەی لەوەوەیە کە گوڵی سەد تمەنی هەر بەم رێگەیە بۆ یەکەمین جار لە ئاسیای ناوەڕاستەوە بەرەو ئەوروپا رەوانە کرا. ئەگەر بەم جۆرە بێت؛ دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەرستۆ ئەم جۆرەی بەهەڵە پۆلێن کردووە. گوڵی سەد تمەنی لە زمانی یۆنانی کۆندا بەمانای بۆتەی.

لەساڵی ٣٣٦پ.ز فیلیپ مەکدۆنی کوژراو کوڕی (١٦) ساڵەی ئەسکەندەر لەسەر تەخت دانیشت. ئەسکەندەر پاش ئەوەی بە خێرایی هەموو ئەو کەسانەی نزیکی دەستەڵات بوون بۆ شوێنی نادیاری ناردن و بەچەند هێرشێکی تیشك ئاسا چەند بەشێکی مەقدۆنیە و ئەلبانیاو پاشان بەرەولای "بولغارستان" و بەرەو لای رووباری "دانوب" لە باکووری یۆنان لە باشوری گرت. (لە رێگادا تبسی بە تەپۆڵکەیەك لە خۆڵەمێش گۆڕی.) پاشان هێزی خۆی بۆ بەکارهێنانی هەموو جیهان کە لەو رۆژەدا دەیان ناسی دەست پێکرد. ئەم جیهانە بە نزیکی هەموو سەرزەویەکانی باکووری ئەفریقاو ئاسیا تاکو سنوری تاشکند و باکووری هندستان بوو. خۆشبەختانە لە وانەکانی جوگرافیای ئەرستۆ ناوی چین نەهاتبوو. ولاَتێك کە لەو رۆژگارەدا لە رۆژئاوادا بوونی هەبوو لێی بێئاگابوون.

لەو کاتەدا ئەرستۆ بۆ ئەستاگیرا نەگەڕابویەوە. بەڵام پێش ئەوەی پیلا بەجێ بهێڵێت کوڕی براکەی ( کالیستنس)ی بۆ کارکردن وەکو زاناو لێکۆڵەری دەربارەی ئەسکەندەر ناساندبوو. ئەم سەخاوەتمەندیەی ئەرستۆ لە ئایندەدا کەم تا زۆر بە سەختی بۆی تەواو بوو. کالیستنس کەمێك قسەی خواروخێچی دەکردو ئەرستۆش پێش سەفەرکردنی ئاگاداری کردبوەوە کە لەلای ئەسکەندەرو دەرباری پاشادا لە قسەکردنی زۆر بێئاگابێت. کاتێك کە ئەسکەندەر بەرەو شەڕکردن و فراوانکردنی دەستەلآتی بەڕێکەوت، کالیستنسی لە پلەی مێژوو نوسی رەسمی لەگەڵ خۆدا برد. بەڵام لەکاتی دەرگیر بوونیان لە شەڕدا لەگەڵ ئێرانیەکاندا وا پێدەچێت کە کالیستنس بە قسە زۆرەکانی بەرو پێشوازی لە تاوانی خیانەت رۆشتووە. پاش ئەوە ئەسکەندەر خستیە نێو قەفەسەوە ئەم قەفەسە هەڵدەگیراو دەگوازرایەوە. کالیستنس لە کاتێکدا کە لەگەڵ سوپادا قەفەسەکەیان رادەکێشا، لە بیابانە سوتێنەرەکانی ئێراندا زامدار بوو، جەستەی لە زام و برین داپۆشراو مێروەکان لەسەر جەستەی هێلانەیان کرد. تاکو ئەوەی سەر ئەنجام ئەسکەندەر لە بینینی ئەم دیمەنە بە جۆرێك بێزار بوو کە (کالیستنس)ی کە کالیستنی خستە بەردەم شێرێکەوە. بەڵام ئەسکەندەر وەکو هەموو ئەو کەسانەی کە خۆیان بەگەورە دەزانن، خاوەنی تایبەتمەندی گومانی خراپ بوو. ئەرستۆی بە ناونیشانی هۆکاری سەرەکی خیانەتی کالیستنس تاوانبار کرد. دەوترێت ئەوەندەی نەمابوو ئەسکەندەر فەرمانی مەرگی ئەرستۆ دەربکات. بەڵام لە کۆتایدا لە جیاتی ئەوە بەرەو هندستان بەڕێکەوت.

ئەرستۆ پاش ئەوەی کە پێنج ساڵ لە ئەستاگیرادا ژیا، بۆ ئەسینا گەڕایەوە لە ساڵی "٣٣٥"پ.ز ئەسپوسیپوس مردو کورسی سەرۆکایەتی ئەکادیمی جارێکی دی چۆڵ بویەوە. کورسی سەرۆکایەتی ئەم جارەیان درا بە "کسنوکراتس" هاوڕێی کۆنی ئەرستۆ. بەو جۆرەی کە چاوەڕوان دەکرا کەسێکی وشك و جیدی بوو. هەروەها کەسایەتیەکی لەسەرخۆو هێمنی هەبوو. هەرچەندە جارێکیان (لە بەتواناییدا لە جەژندا) تاجی زێڕینی پێبەخشرا. (کسنوکراتس پاش "٢٠" ساڵ لەسەر تەختی کورسی شەو لەکاتی رۆشتندا کەوت و لە چاڵێکی ئاودا خنکا.)

ئەرستۆ لەوەی کە ئەم جارەش سەرۆکایەتی ئەکادیمی پێ نەدرا، بەڕادەیەك دڵی رەنجا بڕیاڕیدا قوتابخانەیەکی دیکە بە چاودێری خۆی وەکو ئەکادیمیایەك دابمەزرێنێت. ئەرستۆ قوتابخانەکەی لە تەنیشت دیوارەکانی شاری کێوی لیکابتوس دیاری کرد. ئەم پەرستگای "ئاپۆلو لۆسئوس" (ئاپۆلۆ لە شێوەی گورگدا بوو.) چەسپاو بوو. هەر لەبەر ئەمەش قوتابخانەی ئەرستۆ بە لیسئوم (یالیکیون) ناوبانگی دەرکرد. ئەم ناوە تاکو ئەمڕۆش زیندووە بە شایستە ترین شێوە لە زاراوەی فەڕەنسی"lycee"( بەمانای خوێندنگە) درێژە بە ژیانی خۆی دەدات، بەڵام بە وردی زۆر دیار نیە کە بۆچی ناوی قوتابخانەی یەکەمی ئەرستۆ دەبووایە لە ناوی سالۆنەکانی سەماکردن یاخود پێشانگاکاندا بە زیندوویی بپارێزرێت. بە دڵنیاییەوە لە قوتابخانەی ئەرستۆ لەو رۆژگارەدا بەشی زۆر جۆراو جۆر دەخوێندران. بەڵام سەمای دووکەسی کلاسیك و یاریکەری

تەنها لەسەدەی بیستەمدا لە باکووری ناوەڕاستی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە شێوەی تەواویئەکادیمیا دەرکەوتن.

لێکچوونی قوتابخانەی ئەرستۆ لەگەڵ زانکۆکانی ئەمڕۆدا زۆر زیاتر لە ئەکادیمیای ئەفلاتۆن بوو. فێرخوازان هەر "١٠" رۆژ جارێك لە نێو خۆیاندا رێبەرێکی نوێیان بۆ ئەنجوومەنی قوتابیان هەڵدەبژارد. زانکۆی جۆراو جۆر بۆ راکێشانی فێرخوازان لەگەڵ یەکتردا پێشبڕکێیان دەکرد، "لیسئوم" لێکۆڵینەوەی لە زەمینیەی زانستی جۆراو جۆر لە ئەستۆ دەگرت و ئەنجامەکانی دەخستە بەردەم فێرخوازانەوە، ئەکادیمیای ئەفلاتۆن زیاتر پەیوەست بوو بەوەوە تاکو لە زەمینەی زانستی سیاسەت و مافدا فێرخوازانی فێربکات و زانیاری بنەڕەتی پێویستیان پێبدات، تاکو بتوانن فەرمانڕەوایانی ئایندەی دەوڵەت– شارەکان بن. "لیسئوم.ئیم.ئای.تی[٤] و یاخود تەنانەت دامەزراوەی پێشکەوتووی[٥] ئەو رۆژگارە بوو. بەڵام ئەکادیمیای زیاتر لێکچوونی لەگەڵ زانکۆی "سۆربۆن" یاخود "ئۆکسفۆردی" سەدەی نۆزدەهەمدا بوو.

جیاوازیەکانی لسیئوم و ئەکادیمیا بەدروستی پیشاندەری جیاوازیەکانی نێوان فەلسەفەی ئەرستۆو ئەفلاتۆن بوو. لە کاتێکدا کە ئەفلاتۆن کتێبی "کۆماری"ی دەنووسی، ئەرستۆ رایگەیاند نوسخەکانی یاسا بنەڕەتیەکانی هەموو دەوڵەت و شارەکانی یۆنان کۆبکاتەوەو

١. کورتەی (ئیم. ئای. تی) واتە (پەیمانگای تەکنەلۆژی ماساچوست)ە کە لە ئەمریکاو جیهانی بۆ زانکۆکانی هونەری و زانستی بەکاردێت. (و.فارسی)

٢.Institute of Advanced Studies.

باشترین خاڵی هەریەکەیان هەڵبژێرێت. لسیئوم قوتابخانەیەك بوو کە دەوڵەت- شارەکان کاتێك کە دەیانویست یاسای بنەڕەتی نوسینی نوێی هەبێت روویان لەو دەنا. کەسێك بەدوای بەرپاکردن و دروستکردنی کۆماری (ئەفلاتون) نەبوو. بە داخەوە لێکۆڵینەوەی گشتی ئەرستۆ لەبارەی سیاسەتەوە پێش ئەمە وەکو کرداری بێ بەرهەم بوو؛ هۆکاری ئەم دۆخەش جگە لە خراپ ترین شاگردەکەی ئەسکەندەر بوو کەسێکی دیکە نەبوو. روخساری جیهان بۆ هەمیشە گۆڕانی بەسەردا هات. ئیمپراتۆری نوێ ئەسکەندەر هۆکاری کۆتایی هاتنی تەمەنی دەوڵەت - شارەکانی فەراهەم دەکرد. هەروەك چۆن ئەمڕۆش ولاتە یەکگرتووەکانی قاڕەی ( وەکو یەکێتی ئەوروپا) مومکینە زەنگی مەرگی دەوڵەتە سەربەخۆ نەتەوەیەکان لێبدەن. نەك تەنها ئەرستۆ بەڵکو هیچ کەس لەو ژمارە زۆرەی رۆشنبیران و بیرمەندانی کە لە قوتابخانەو خوێندنگاکانی ئەسینا کۆبووبونەوە سەرنجیان لەم گۆڕانە مێژووییە گەورەیە نەدابوو، بێئاگایی ئەمانە وەکو بێئاگایی رۆشنبیرانی سەدەی نۆزدە لە مارکسەوە تاکو نیچە بوو. کە نەیانتوانی پێشبینی گەورەیی و بەرزتری دیاردەیەك بەناوی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە بکەن.

ئەرستۆ خۆی وابوو کەوانەکان و قسەکانی لە لسیئوم لەکاتی رێگە رۆشتن و هاورێ لەگەڵ فێرخوازانی بڵێتەوە لەم روەوە پەیڕەوانی قوتابخانەکەی بەرێگە رۆشتووان[٦] ناسران. (کەسانێك کە هەنگاو

---

٢.Peripatetic

هەڵدەگرن یاخود بە ڕێگادا دەڕۆن) بەم حاڵەوە هەندێکی دیکە باوەڕیان وایە کە ئەمانە لەم ڕووەوە ئەم ناوەیان لێنراوە کە مامۆستاکەیەن لە شوێنێکی بەرز یاخود لە سەر ڕێگەی ڕۆشتن و شوێنی دیار وانەی دەوتەوە. (کە پێی دەڵێن پری پاتوس)[٧]

بونیاد نەرو دامەزرێنەری زانستی لۆژیك دەدەنە پاڵ ئەرستۆ (زیاد لە "٢٠٠٠"دووهەزار ساڵ درێژەی کێشا تاکو لۆژیك زانێکی دیکەی هاوشانی ئەرستۆ خۆی پیشان بدات.) ئەو لەگەڵ ئەوەشدا تارادەیەك میتافیزیك ناسیدا هاوتای ئەفلاتۆنیش بوو، لە زەمینەی زانستی ئەخلاق و خودناسی پێشی مامۆستاکەی کەوت. (بەهۆی ئەم دەستکەوتە گرانبەهایانەوە ئەفلاتۆن لە شێوەی بیرمەندێکی داهێنەرو دۆزەرەوە کەمێك لەسەرووی ئەوەوەیە. ئەگەر چی ئەرستۆ مومکینە چەند وەڵامێکی دۆزیبێتەوە، بەڵام ئەوە ئەفلاتۆن بوو کە پرسیاری بونیادی کە دەبوو لە هەنگاوی یەکەمدا پرسیاریان لە بارەوە بکەین دۆزیەوە.)

بەرجەستەترین دەستکەوتی ئەرستۆ لە زەمینەی لۆژیکدابوو. لەراستیدا ئەو بە بونیادنەری ئەم بەشە لە مەعریفەت دەژمێرێت. ئەرستۆ لۆژیکی بە پایەو بنەڕەتێك دەخستەڕوو کە هەرجۆرە مەعریفەتێکی لەسەر وەستاوە. ئەفلاتۆن پێشتر لەسەر ئەمە وەستابوو کە بەرهەمی مەعریفەت، لە ڕێگەی دیالێکتیك (واتە گفتوگۆو باسکردن بە ڕێگەی پرسیارو وەڵام) مومکینە، بەڵام ئەوە ئەرستۆ بوو کەبە دۆزینەوەی

---

١.Peripatetic

باشترین خاڵی هەریەکەیان هەڵبژێرێت. لسیئوم قوتابخانەیەك بوو کە دەوڵەت– شارەکان کاتێك کە دەیانویست یاسای بنەڕەتی نوسینی نوێی هەبێت روویان لەو دەنا. کەسێك بەدوای بەرپاکردن و دروستکردنی کۆماری (ئەفلاتۆن) نەبوو. بە داخەوە لێکۆڵینەوەی گشتی ئەرستۆ لەبارەی سیاسەتەوە پێش ئەمە وەکو کرداری بێ بەرهەم بوو؛ هۆکاری ئەم دۆخەش جگە لە خراپ ترین شاگردەکەی ئەسکەندەر بوو کەسێکی دیکە نەبوو. روخساری جیهان بۆ هەمیشە گۆڕانی بەسەردا هات. ئیمپڕاتۆری نوێ ئەسکەندەر هۆکاری کۆتایی هاتنی تەمەنی دەوڵەت – شارەکانی فەراهەم دەکرد. هەروەك چۆن ئەمڕۆش ولاتە یەکگرتووەکانی قارەی ( وەکو یەکێتی ئەوروپا) مومکینە زەنگی مەرگی دەوڵەتە سەربەخۆ نەتەوەیەکان لێبدەن. نەك تەنها ئەرستۆ بەڵکو هیچ کەس لەو ژمارە زۆرەی رۆشنبیران و بیرمەندانی کە لە قوتابخانەو خوێندنگاکانی ئەسینا کۆبووبونەوە سەرنجیان لەم گۆڕانە مێژووییە گەورەیە نەدابوو، بێئاگایی ئەمانە وەکو بێئاگایی رۆشنبیرانی سەدەی نۆزدە لە مارکسەوە تاکو نیچە بوو. کە نەیانتوانی پێشبینی گەورەیی و بەرزتری دیاردەیەك بەناوی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە بکەن.

ئەرستۆ خۆی وابوو کەوانەکان و قسەکانی لە لسیئوم لەکاتی رێگە رۆشتن و هاوڕێ لەگەڵ فێرخوازانی بلێتەوە لەم روەوە پەیڕەوانی قوتابخانەکەی بەرێگە رۆشتووان[٦] ناسران. (کەسانێك کە هەنگاو

---

٣.Peripatetic

هەڵدەگرن یاخود بە رێگادا دەڕۆن) بەم حاڵەوە هەندێکی دیکە باوەڕیان وایە کە ئەمانە لەم روەوە ئەم ناوەیان لێنراوە کە مامۆستاکەیەن لە شوێنێکی بەرز یاخود لە سەر رێگەی رۆشتن و شوێنی دیار وانەی دەوتەوە. (کە پێی دەلێن پری پاتوس) [٧]

بونیاد نەرو دامەزرێنەری زانستی لۆژیك دەدەنە پاڵ ئەرستۆ (زیاد لە "٢٠٠٠"دووهەزار ساڵ درێژەی کێشا تاکو لۆژیك زانێکی دیکەی هاوشانی ئەرستۆ خۆی پیشان بدات.) ئەو لەگەڵ ئەوەشدا تارادەیەك میتافیزیك ناسیدا هاوتای ئەفلاتۆنیش بوو، لە زەمینەی زانستی ئەخلاق و خودناسی پێشی مامۆستاکەی کەوت. (بەهۆی ئەم دەستکەوتە گرانبەهایانەوە ئەفلاتۆن لە شێوەی بیرمەندێکی داهێنەرو دۆزەرەوە کەمێك لەسەرووی ئەوەوەیە. ئەگەر چی ئەرستۆ مومکینە چەند وەلامێکی دۆزیبێتەوە؛ بەلام ئەوە ئەفلاتۆن بوو کە پرسیاری بونیادی کە دەبوو لە هەنگاوی یەکەمدا پرسیاریان لە بارەوە بکەین دۆزیەوە.)

بەرجەستەترین دەستکەوتی ئەرستۆ لە زەمینەی لۆژیکدابوو. لەراستیدا ئەو بە بونیادنەری ئەم بەشە لە مەعریفەت دەژمێرێت. ئەرستۆ لۆژیکی بە پایەو بنەڕەتێك دەخستەڕوو کە هەرجۆرە مەعریفەتێکی لەسەر وەستاوە. ئەفلاتۆن پێشتر لەسەر ئەمە وەستابوو کە بەرهەمی مەعریفەت، لە رێگەی دیالێکتیك (واتە گفتوگۆو باسکردن بە رێگەی پرسیارو وەلام) مومکینە، بەلام ئەوە ئەرستۆ بوو کەبە دۆزینەوەی

---

١.Peripatetic

بکات. لەم بنەما یەکەمینانە یاخود بەڵگە نەویستانەی راستیەتی ئەو زانستە دەتوانرێت بەسوود وەرگرتن لە لۆژیك بەرهەم بهێنرێت (یاخود شیبکرێتەوە) ئەم بنەما یەکەمینانە یاخود بەڵگە نەویستانە چوارچێوەی چالاکی بابەتەکە پێك دەهێنن و لە توخمی پێچراو یاخود ناسازگاری جیای دەکەنەوە. بۆ نموونە ژینگە نایس و هونەری شاعیری لە پێشەکیەك دەست پێدەکەن کە لەیەکتری جیاوازن. لەم روەوە گیانلەبەرانی ئەفسانەیی بابەتی ژینگە ناسی نیەو ئەم زانستە پێویستی بەوە نیە بە شێوەیەکی رێکخراو بنوسرێت. ئەم ئاراستە لۆژیکیە هەموو زەمینەو بوارەکانی مەعریفەتی ئازاد کرد و توانای پێبەخشین کە هەمووان کۆمەڵە گشتیە نوێیەکانی راستیەکان ئاشکرا بکەن. لەماوەی "٢٠٠٠" دووهەزار ساڵی دواتر هەر ئەم پێناسانە خوودی خۆیان بەچەند چەمکێکی بەستراو سنوردار گۆڕی و رێگەیان لەسەر پێشکەوتنی مەعریفەی مرۆیی بەست.

لە تێپەڕ بوونی چەندین سەدە؛ فەلسەفە هەمان بیرکردنەوەی ئورستۆ بوو. لە سەدەکانی ناوەڕاست ئەندێشەو بیرکردنەوەی ئەرستۆ بەسروش (وەحی)ێکی دابەزیوو لە قەڵەم دەدراو رێگەی لەسەر پێشکەوتن و پێشکەوتوویی و گەشەسەندنی زیاتر لە رابردووی (حەوزە مەعریفیەکان) بەست. مومکینە بیرکردنەوەی ئەرستۆ کۆشکی فیکری جیهانی سەدەکانی ناوەڕاستی دروست کردبێت، بەڵام گوناه لە ئەرستۆوە نەبوو کە ئەم کۆشکە سەرئەنجام بە زیندان گۆڕا. ئەگەر ئەرستۆ زیندوو بوایە هەرگیز بەم جۆرە رێگەی نەدەدا. لە گۆشەو کەناری ئەرستۆ ناسازگاری و دژەیەکی بەرچاو دەکەوێت کە نیشانەی هزری هەمیشەیی پشکێنەرو

نەمرە. ئەو پشکنین و لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی کاریگەری واقیعی جیهانی بوونی لەسەر روانینی رووت سەبارەت بە چۆنیەتی و سروشتی دەگەڕاندەوە. تەنانەت هەڵەکانی ئەرستۆ زۆربەیان رەنگێکی شاعیرانەیان هەیەو لە بینایی شاعیرانەوەن، بۆ نموونە: لەوجێگەیەی کە دەڵێت ((تورەیی، کولانی خوێنە لە دەورووبەری دڵ)) وە یاخود ((رەنگی چاو ئاسمان شین دەکات.)) ئەو بە پەیڕەو یکردن لە سونەتی چاکی یۆنانیەکان فێرکردن و پەروەردەکردنی بە ڕێگەی پێشکەوتنی مرۆڤی دەزانی و باوەڕی وابوو کە جیاوازی مرۆڤی هەڵکەوتوو بلیمەت و مرۆڤی نا بلیمەت ((بە ئەندازەی جیاوازی زیندوو مردووە.)) بەم حاڵەوە دەرکی ئەو لە پایەی فێرکردن و پەروەردە لە خۆشبینی رووکەشیەوە نەبوو: ((فێرکردن و پەروەردە وەکو جوانیەکە لەکاتی جوانی و شایستەیی و بەهرەمەندی و هەروەها وەك قەڵغانێکی پتەو لەسەردەمی تیر هاویشتندا)) مومکینە کاری ئەرستۆ هەندێك جار بە گەورەیی فرۆشتن بەئەنجام گەیەنرابێت و لێکدرابێتەوە، بەڵام ئەو چەند ئاماژەیەکی هەیە لەوەوە سەرچاوە دەگرن کە بەشی خۆی لە رەنج و ناڕەحەتیەوە ئەزموون کردووە. ئەرستۆ لە هەموو تەمەنیدا وەکو مامۆستایە و هیچ کات بەدوای پلەو پایەی دەوڵەتدا نەبووە. بەم حاڵەوە هیچ کەس تاکو ئێستا لە سەرانسەری مێژووی مرۆڤایەتیدا کاریگەرییەکی نەمری بەم جۆرەی لەسەر جیهان جێنە هێشتووە.

لەم روەوە ئێمە خۆشبەختین، چونکە وا پێدەچێ کە ئەرستۆ کە پیاوێکی چاك بوو بێت. ئەو ئامانج و مەبەستی مرۆڤی لە داواکردنی

خۆشبەختی دەزانی، کە لە بۆچونی ئەودا بەمانای ئەوە دێت باشترین شتێك کە ئێمە ئامادەگی ئەو شتانەمان تێدایە کرداری پێ ببەخشرێت واتە بکرێتە شتێکی کرداری. بەلأم باشترین شتێك کە ئامادەگی ئەو شتەمان تێدایە چیە؟ بە بۆچونی ئەرستۆ، ژیری والأترین و فراوانترین هێزی مرۆڤە. کەواتە (( باشترین و (خۆشبەخترین) مرۆڤ کەسێکە تاکو ئەو جێگەیەی کە دەتوانێت کاتەکانی خۆی لە دەگمەن ترین چالاکی عەقڵدا بەکار بهێنێت کە بریتیە لە تیۆردانان)) ئم بۆچوونە تاکو سنورێکی زۆر، دیدگای مامۆستایانەو پاکانەیە دەربارەی گوتەزای خۆشبەختی: خوازیاری چێژ لە قاڵبی کاری یکری و تیۆری رووت. لە دونیای واقعیدا کە ئێمەی تێدا دەژین کەمتر کەسێك لەسەر بۆچونێکی لەم جۆرە بە تەواوی دەزانێت. (ئەوانەی کە لەم بابەتەدا لەگەڵ ئەرستۆدا هاوبیروباوەڕن وا پێناچێت کە خۆشترو خۆشبەختتر لە کەسێکی بێ فەرهەنگ و بێ هزرو فیکربن کە بەخۆشیەوە لە پێشبڕکێی تاقیکردنەوەی بەختدا پارەی بەدەست هێنا بێت و شتێکی دەستکەوتبێت .)

چەند رەخنەیەکی دیکە لەسەر ئەرستۆ بونیان هەیە کە وەکو ئەم بۆچوونەن لە بابەتی ئەوەی ئێمە دەبێت هەوڵبدەین بەوەی کە لەئێمەدا باشتر نیە بیکەینە کردار. دەتوانرێت بەڵگە بهێنرێتەوە کە شاگردی بەناوبانگی "ئەسکەندەر" هەوڵی دەدا باشترین شتێك کە ئامادەگی ئەو شتەی تێدابوو بیکاتە کردارو لەم رێگەیەوە رەنج و سەختی و مەرگی هەزاران هەزار مرۆڤی بێتاوانی هێنایەکایەوە. بەم جۆرە، دەتوانرێت بەم شێوەیەش بەڵگەی ئەوە بهێنرێتەوە کە ئەرستۆ بە فێرکاری بەناوبانگی

خۆی بەناوی (سنوری مامناوەند) بەدوای ئەوەوەبوو کە رێگری ئەم جۆر رۆچونەی کارە ئەخلاقیەکان بێت.

بەپێی ئەم فێرکاریە، هەر فەزیلەتێك سنووری ناوەندی دوو سنوری رۆچوون و رۆنەچوونە. ئەم بۆچوونە یاد هێنەرەوەی چەمکی یۆنانی مام ناوەند بوونە، تەنانەت لە نوسینەکانی "هومردا" کە نزیك بە "٥٠٠" پێنج سەدسالّ پێش ئەرستۆ ژیاوەو ئەو رووداوانەی کە "١٠٠٠" هەزارسالّ پێش لە دایك بوونی ئەرستۆ روویان دابوو، راڤەی دەکردن ئەم چەمکە بەرچاودەکەوێت. یۆنانیە یەکەمینەو پێشینەکان (لەراستیدا، یۆنانیەکانی قۆناغی دەاتری کۆنە) پێویستیەکی زۆریان بە چەمکی مام ناوەندبوون دەدا. وەکو زۆر((رۆچوون دەچۆ)) بە زوویی لە پلەی یەکێك لە یاساو رێسا بنەڕتیەکان بۆ رێنموونی ئەخلاقی هەڵبژێردرا. رەفتاری لەگەڵ خۆشگوزەرانی پەرستراوەکانی "دیونوسیوس"[1] ، لایەنە تاریکەکانی کەسێتی وئایینی کە لە تراژیدیای یۆنانیدا درێژەی کێشا، ترسەکان و بیروباوەڕە خورافیەکانی ژیانی رۆژانە؛ هەموو ئەمانە لایەنی تاریکی سەرەتای سەدەی کلاسیك بوون. بۆ ئەوەی فەلسەفە، بیرکاری، هونەر بتوانن لە ناخی ئەم تێکرژان و کەوتن و بێ نرخی ببنە زانست و شێوەی زانستی، رەچاو کردنی سنوری بەرزی پێویست بوو. هەر بەوجۆرەی کە چاوەڕوان دەکرا، کەواتە "فیثاغورس" هەوڵی دەدا چەمکی لەگەڵ ماتماتیکدا گرێ بدات، تاکو ئەوەی بتوانرێت فەزیلەتی نێوان دوو سنوری

١. خودای شەراب و مەی نۆشین لە ئەفسانەی یۆنانیدا (و.فارسی)

ڕۆچوون و زیادەڕەوی (بەپێی ماتماتیک) بپێوێت. هەرئەوەی لە تەرازووی ئەندازەگرتندا جێگەی نەگرتایە یاخود لە بنەڕەتدا هەر ئەندازەی نەگیرایە. (وەکو چەمکی ناکۆتا) ئەوە بەشەڕ دەژمێردرا. وردبوونەوە خودی فەزیلەتێك بوو. (لایەنی بەهێزی لەم ڕووەوە لەم شێوەیە تاکو ئەمرۆش لە ئەخلاقیاتی سەر زەمینی ڕۆژئاوادا شایەنی ئەوەیە بناسرێت)

ئەفلاتۆن کە عیشقی بۆ ماتماتیك و بیرکردنەوەی ململانێیانە هەبوو. لەگەڵ زۆرێك لەم بیرو باوەڕانە هاوڕابوو. بە پێچەوانەی ئەوەوە، ئەرستۆ ئالآی پێچەوانەو دژی لەگەڵ ئاڕاستەی ماتماتیك ئاسای لەگەڵ بابەتە ئەخلاقیەکاندا هەڵکرد. (ئەو دەیوت) مومکین نیە ئێمە بتوانین چاکەو خێر (بە وردبینی و وردی ماتماتیك) بژمێرین. خێرو چاکە بەوجۆرە نیە کەبەتێبینی رووتی تەواو دیاری بکرێت. بەڵکو زیاتر شتێکە وەکو ئەو هەماهەنگەی کە لەبەرهەمێکی هونەریدا بەرچاو دەکەوێت. (ڕاستە کە) فەزیلەتی ئەخلاقی سنووری ناوەندی زێدەرۆیی و ڕۆچوونە، بەلآم نێوەند بوونە زیاتر پەیوەندی بە سروشتی تاك و ئەو مەرجانەوە هەیە کە تێیدایە. کوشتنی مرۆڤێك لە مەیدانی جەنگدا لەگەڵ کوشتنی مرۆڤێك لەشەقامدا جیاوازی هەیە. و تەنانەت لێرەدا جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی کە کەسێك بەمەبەستی ئەوە بکوژرێت کە دزی کردووە یاخود خراپەی بەرامبەر کەسەکە کردبێت کوژرابێت. لەگەڵ ئەم تێڕوانینەی ئەرستۆ سەبارەت بە هەماهەنگی، توخمێکی پێویست لە ڕێژەگەرایی هاتە کایەوەکە ئەویش لە خودی (ئایدیای) مامناوەند بوونەوە بوو.

کێشه کاتێك سەردەردەهێنێت کە بمانەوێت ئەم ئەخلاقیاتە بەشێوەیەکی دورو درێژ بەش بەش ئامادەبکەین و دروستی بکەین. ئەگەر بەوجۆرە کە تیۆری (سنوری مامناوەند بوون– اعتدال) بانگەشەی دەکات، هەر فەزیلەتێك سنورێکی ناوەندە لە نێوان دوو سنوری رۆچوون و زیادەرۆیی. ئەم لێکچوون و زیادەرۆییە کوت ومت چ شتانێکن؟ ئەگەر گەرمی و سوربوونی سروشتی یۆنانیەکانی کۆنمان نەبێتو لە نێوان ئێمەو دوو سنوری ترسناك رۆچوون و زیادەرۆیی پەیوەندیەکی نزیك بوونی نەبێت، ئەوکات ئەم فێرکاریە بەشتێکی وتراو تەنها زارەکی لێ دێت. ئەوەی کە ئێمە راستگۆیی بەو شتە بزانین کە سنوری مام ناوەندی درۆ وتن لە لایەکەوە چاککردنی درۆ لە لایەکی دیکەوەیە، مومکینە قسەیەکی هەڵکەوتوو ئامێز بێت. بەڵام لە تێڕوانینی ئەخلاقیەوە پوچ و بێ ناوەرۆکە. (هەڵبەتە ئەو پێناسەیەی کە لێرەدا بۆ راستگۆیی هێنام لە ئەرستۆوە نیە؛ بە کورتی ئەرستۆ بۆ پڕکردنەوەی ئەو درزو بۆشاییەی کە لەبەڵگە هێنانەوەیدا بوونی هەیە؛ دەبوو بابەتەکە بەم جۆرە شیکار بکات. لەساڵەکانی کۆتایی ژیانی ئەرستۆ، هاوسەرەکەی "پویتاس" کۆچی دوایی کرد وەك زانراوە ژیانی ژن و مێردایەتی بە چێژی ئەرستۆ خۆش بووە، پاش مردنی هاوسەرەکەی لەگەڵ خزمەتکارەکەی "هرپولیس" ژیانی هاوسەری پێکهێنا. لە ئەنجامی ئەم هاوسەر گیریەش ئەرستۆ بوویە خاوەنی یەکەمین منداڵی کەناوی "نیکوماخوس"ی لێنا. لەساڵی "٣٢٣"پ.ز هەواڵ گەیشتە ئەسینا کە ئەسکەندەر لە میوانداریەکدا لەبابل بەهۆی زۆر خواردنەوەی شەراب لەگەڵ کەسە

گەورەو پلە دارەکانی دیکەدا مردووە. خەڵکی ئەسینا لەبەر ئەوەی لە ژێر دەستەلاتی مەقدۆنیە بێ فەرهەنگەکان بوون لە مێژووە ئازاریان چەشتبوو لە دوای مەرگی ئەسکەندەر هەستەکانی خۆیان ئاشکراکرد. ئەرستۆ کە لە مەقدۆنیەدا لە دایك بوو بوو هەمووان دەیانزانی کەبە تواناترین کەسە بۆ لە ئەستۆگرتنی پەروەردەکردنی ئەو سەرزەمینە کە ئەو کورە بوویە قوربانی ئەم شەپۆلی هەستی دژە مەقدۆنیە. بە تاوانی دروستکردنی تۆمەتی بێ دینی رەوانەی دادگا کراو بانگهێشتی دادگایان کرد، ئەو کەسەی ئەرستۆی تاوانبارکرد ناوی "ئورومدون" بوو کاهین بوو. ئەو ستایش نامەی کە ئەرستۆ "٢٠" ساڵ لەمەو بەر بە بۆنەی مەرگی گەورەکەی "هرمیاس خواجە" نوسیبووی بە ناونیشانی بەڵگەی تاوان لەدەستی ئەم کاهینەدا بوو. ئەم ستایشەش ئەم بەیتانەی لە خۆگرتبوو.

(( کوڕانی خوداکان بۆ گەیشتن بەتۆ هەوڵیان دەدا

و قارەمان بۆ سەرزەوی گەڕانەوە

هەمووان بۆ عیشقێك کە بۆ تۆیان هەیە و بۆ بینینی روخساری تۆ.))

ئەم ستایشە دەکرا زۆر بە قورسی و سەختی بە دژە ئایینی و کافر بوون لەقەڵەم بدرایە. بەڵام دروستکراوەکانی خودا قوربانیانیان دەویست، ئەگەر ئەرستۆ بەو حوکمە خۆی بەدەستەوە بدایە، فەرمانی مەرگی شتێکی حەتمی بوو. بەڵام پێکهاتەی ئەرستۆ لە رەگەزی پێکهاتەو شێوازی سوکرات نەبوو، ئەو هیچ پەیوەندیەکی بە شەهید بوونەوە نەبوو. (هەرلەبەر ئەمەش) رێگەی ژیرانەی هەڵبژارد لە شار رایکرد، تاکو خەڵکی

ئاتن (لەوەی کە دووبارە بەهۆی دژبوونی فەلسەفەوە توشی گوناه بن) رزگار بکات.

بڕیاری بەجێ هێشتنی ئاتن بۆ ئەرستۆ ئاسان نەبوو. ئەم بڕیارە بەمانای بەجێهێشتنی قوتابخانە خۆشەویستەکەی لسیئوم بوو سوڤ بەتەمەن کەئیدی لە کتێبخانەو دەست گەیشتن بە لێکۆڵینەوەو زانیاریەکانی بێ بەش بوو بوو لەکەناری موڵکێك لە خالکیس کە میراتی باوکی بوو گۆشەنشین بوو. ئەم شارە دەکەوێتە "٣٠" میلێك لە باکوری ئاتن، لە جەزیرەی درێژی ئوبوئیا لە خاڵێك کە جەزیرەکە بەهۆی کەناڵێکی باریکی وشکیەوە جیابۆتەوە لە ئاوەکانی ئەم کەناڵە دیاردەیەکی نادیار بوونی هەیە. بەهۆی ئەوەی کە لە هەڵکشان و داکشانی دەریای ئیجە تاڕادەیەك کاریگەریەك دیار نیە. جووڵەی ئاوێکی توند لەم کەناڵەدا روودەدات و جوڵەو رووگەی ئەم ئاوەش "١٢" دوانزە جار لە رۆژێکدا دەگۆڕێت بەبێ ئەوەی هیچ روونکردنەوەیەك لەم بارەیەوە سەبارەت بەم رووداوە بزانین. بەر مەبنای ئەفسانەیەکی ناوچەیی کۆن؛ ئەرستۆ چەند رۆژ بەمەستی دۆزینەوەی روونکردنەوەیەك بۆ ئەم دیاردەیە، مێشکی خۆی ئازارداو بۆ یەکەمین جار لە ژیاندا هەستی کرد زاڵ بوەو سەرکەوتووە هەر لەوشوێنەدا خۆی فرێدایە نێو ئاوەکەوەو نقوم بوو خنکا.

**لە سەرچاوەی باوزەڕ پێکراوی مێژووییدا هاتووە کە ئەرستۆ لە ساڵی "٣٢٢"پ.ز واتە: ساڵێك پاش ئەوەی رۆشتن بۆ خاکلیس، لە تەمەنی "٦٢" ساڵیدا کۆچی کرد. دەوترێت کە بەهۆی نەخۆشی گەدەوە**

مردووە،بەلام یەکێك لەسەرچاوەکان بانگەشەی ئەوە دەکات کە بەخواردنەوەی "ئەقونیطون" شلەیەکی ژەهراوی گیایە کە هەر بەناوی گیاکەوە ناونراوە، کۆتایی بە ژیانی خۆی هێناوە. لەو رۆژگارەدا ئەم پالأوتەی گیایە بە شێوەی دەرمان هکار دەهێنراو لەبەر ئەم بنەمایەش گومانی من لەسەر ئەوەیە کە رەنگە ئەرستۆ لەکاتی بەکارهێنانیدا بڕێکی زۆری لە بڕی هەمیشەیی بەکار هێنابێت یان مەرگی ئاسانی بەدەستی خۆی بەباشتر زانیبێت و راستەوخۆ دەستی بەخۆ کوشتن نەکردبێت. بەلام دیسان رەنگە گریمانەی ئەوەش هەبێت کە بەهۆی چەشتنی کالأو دڵشکانەوە بەهۆی لە دەستدانی لسیئوم وای لێکردبێت و بەجێگەیەکی گەیاندبێت کە ئیدی بەڵگەیەکی بۆ درێژەدان بە ژیانی خۆی نەبینێت.

وەسیەتی ئەرستۆ بەم رستە نەمرانە کۆتایی دێت: ((هەموو شتێك بەچاکی چووە پێشەوە بەلام لە کاتێکدا کە رووداوێك رووبدات.)) و لە درێژەیدا رئوس هەموو دەستورەکانی خۆی سەبارەت بەچۆنیەتی سەرپەرشتی کردنی منداڵەکانی هەروەها ئازاد کردنی بەندەکانی دەژمارد. پاشان بە میراتگری خۆی دەڵێت: ئەگەر هرپولیس حەزی لە هاوسەرگیری نوێ بوو. ((دەبێت لەگەڵ کەسێکدا هاوسەر گیری بکات کە شایستە بێت)) نووسەری ئەم بەڵگە نامەیە لە بنەڕەتدا وشك و سروشت چاك بووە. پیاوێك کەبلیمەتی تەواو دیارو بەرزی بە ئاشکرا کەسێتی ئەوی بەهەڵەدا نەبردووەو بە تەواوی بێ کەم و کورتی باسی کردووە. ئەرستۆ لە کۆتای وەسیەتەکەیدا، داوای ئەوە دەکات کە بەشێك لە میراتی

ئامادەی لە دروستکردن و بەرپاکردنی پەیکەرەکانی زیوس و ئاتنادا لە ئەندازەی سروشتی لە ئەستاگیرا خەرج بکرێت.

چەند ساڵێ لەمەو بەر لە یۆناندا پاش نیوەڕۆیەك سەرئەنجام کاتێك بوو کە ئیدی خێرایی تۆفان کەم بوو بوویەوە گەیشتمە ئەستاگیرای کۆن، بەڵام لەوێ لە نێوان بەردە پەرش و بڵاوەکان و بەباران شۆراوە نیشانەیەك لەم پەیکەرانەم نەدۆزیەوە . کاتێك کوێرانە لە سەرووی گردەکانەوە بەرێگادا دەرۆشتم کەوتمە یادی روانینی ئەرستۆ سەبارەت بە چیەتی کۆمیدی. ئەو دەیگوت شتە خەندە ئامێزو پێکەنیناویەکان شێوەیەکی بێ سەر ئێشەی ناشرینەکانن. من کە جەستەم لەسەرمکادا گرژ بووبوبوویەوە و دیمەنی بەرامبەریشم بەهرەیەکی لە جوانی تێدا نەبوو، سەرەنجی ئەم داخوازیە بووم کە بیرکردنەوەی ئەرستۆ بەلایەنی کەمەوە تاکو ئەو شوێنەی کەبە چیەتی پێکەنینەوە پەیوەستە، هێشتاش بەهرەیەکی لە سوودمەندی هەیە.

داهێنان و تازەگەری ئەرستۆ لە مێژووی فەلسەفەدا هاوشێوەیەکی نیە. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا ئەویش کەوتە نێو چاڵی بەتەمەنترین فێڵی فەلسەفی. فێڵ و تەڵەکەیەك کە تاکو ئەمڕۆش لەگەڵماندایە. سیرو لە جێگایەك دەڵێت: ((ئەرستۆ فەیلەسوفانی پێش خۆی سەرزەنشت دەکرد لە بابەتی ئەوەی کە گومانیان دەکرد هەوڵ و کۆششی فیکری خۆیان بخەنەگەڕ بۆ ئەوەی فەلسەفە بۆ تەنها جارێك بۆ هەمیشە تەواو بکەن و ناتەواوی تێدا نەهێڵن ئیدی بەسە. ئەو باوەڕی وابوو کە ئەم فەیلەسوفانەیان زۆر گەوج و گێلن یان زۆر خۆ بەشت زانن کە بەم جۆرە

بیردەکەنەوە. بەم حاڵەوە کاتێك کە فەلسەفە تەنها لە ماوەی چەند ساڵێکدا بەو جۆرە ئەو هەنگاوە گەورانەی بەرەو پێشەوە هاویشت، خودی ئەرستۆش ئەو وەڵامەی دەستکەوت کە فەلسەفە بە زوویی بەرەو کۆتایی نزیك بە سەرکەوتن دەگات.))

# ساتێک لەگەڵ ئەرستۆ

**پاشکۆ:**

کاتێك کە ئەرستۆ لە ساڵی "٣٢٣"پ.ز ناچار بوو لە وئەسینا رابکات، سەرپەرشتی کردنی لیسئومی بە "تیۆفراستوس" سپارد. دڵی وابەستەی عیشقی ئەرستۆ بوو. کە لەوکاتەدا لە شاگردەکانی بوو. تیۆفراستوس بەردەوامی لیسئوم پاش رۆیشتنی بونیاد نەرەکەی لە خۆگرت و بوویە جێنشینی، زۆر تێنەپەڕی کە فەیلەسوفانی مەشایی، بە پەیڕەوی لە ناونیشانی خۆیان "مشایی" لە دوورترین خاڵی جیهانی یۆنانەوە هەنگاویان ناو فەلسەفەی ئەرستۆ یان لەگەڵ خۆیان بۆ هەموو جیهان برد.

بەم حاڵەوە، ماوەی سێ سەدە پاش مەرگی ئەرستۆ بوو کە کۆبەرهەمی بەو جۆرەی ئەمڕۆ دەیان ناسین کۆبویەوە. دەتوانێت بەرهەمەکانی ئەرستۆ بە دوو دەستە دابەشیان بکەین. یەکێکیان ئەو دەستەیە لە نوسینەکان کە ئەرستۆ بە مەبەستی بڵاوبوونەوەیان نوسینی، ئەوانی دیکەشیان ئەو یاداشتانەن کە وانەکانی لەخۆ دەگرن لە لیسئومدا (کە مەبەستی بڵاو بوونەوەیان لە پشتەوە نەبووە) چارەنووس هیچ یەك

لە بەرهەمەکانی دەستەی یەکەمی بۆ ئێمە نەهێشتۆتەوە. ئەوەی کە لە ئەرستۆوە پێمان گەیشتووە هەموویان لە دەستەی دووەمن. ئەم بەرهەمانە لەسەرەتادا شێوەیەکی بڵاو پچرپچڕیان هەبوو لە چەندین نامە پێکهاتبوون. ئاندرونیکوس رووسی کە کۆتا سەرپەرشتیاری لیسئوم بوو ئەم بەرهەمانەی لەچەندین کۆمەڵدا بە چەند ناونیشانێکی جیاوازی کۆکردنەوە. ئێمە بۆ زاراوەی ئەودیو سروشت (میتافیزیك) منەتکاری ئەندرونیکوسن. ئەو ئەم ناوەی بۆ دەستەیەك لەبەرهەمەکانی ئەرستۆ دانا. ئەم بەرهەمانە لە سەرەتادا ناونیشانێکی تایبەتیان نەبوو، بەتەواوی پاش ئەو بەرهەمانەی کە بە میتافیزیکەوە پەیوەست بوون و جێگیر بوون و پەیدابوون. لەم روەوە ئەندرونیکوس بەسادەیی ئەو شتانەی (پاش میتافیزیك) یان بە زمانی یۆنانی باستان ناوی (میتافیزیکی) لێنان. ئەم بەشە لە بەرهەمەکانی ئەرستۆو چەند پەیامێك سەبارەت بە بوون ناسی (سروشت و پەیوەندی بوون) و هەروەها چیەتی کۆتایی شتەکان دەگرێتەوە. ئەم بەشە لە زانست بە خێرایی و بەو ناونیشانەی کە بەم بەرهەمە درابوو واتە میتافیزیك بوون بەیەك. بەم شێوەیە وشەی میتافیزیك کە لە تێپەڕ بوونی چەندین سەدە لەگەڵ خودی فەلسەفە بۆتە هاو واتا، لە بنەڕەتدا ئەو پەیوەندیەی کە میتافیزیك وەسفی دەکات پەیوەندی بە فەلسەفەوە نیە. دروست وەکو خودی فەلسەفە. بەشێکی زۆر بچوکی ئەم ناونیشانە پەیوەست بوو بەو هەڵگۆزینە نادروست و هەڵەوەو لەوکاتەدا بەدواوە بەهەمان شێوە درێژەی بە گەشەی خۆی داوە.

لە قۆناغی شارستانیەتی کۆنی یۆنانی و رۆم، ئەرستۆ بە یەکێك لە فەیلەسوفەگەورەکانی یۆنان هاوشان لەگەڵ کەسانێکی وەکو سوکرات یان ئەفلاتۆن نەناسرا. سەردەمی شارستانیەتی رۆمی، ئەرستۆ وەکو لۆژیك زانێکی بەرجەستە باس دەکرا، بەڵام بەشەکانی دیکەی فەلسەفەی بەزۆری لە سێبەری قوتابخانەی ئەفلاتۆنی نویێ گەشەی ئەوەیان پێنەدرا خۆیان پیشان بدەن و لەسەدەکانی دواتریشدا بەزۆری بەرەو مەسیحیەت رۆیشتن.

بیرمەندانی مەسیحی بەخێرایی سودی لۆژیکی ئەرستۆیان بۆ دەرکەوت، لەسەر ئەم بنەڕەتە، ئێستا ئەرستۆ پلەی مەرجەعی بەرزو رێگەی فەلسەفی بەدەستهێنا. لەسەرتاسەری سەدەکانی ناوەڕاست لۆژیکی ئەرستۆیی پایەو بنەڕەتی گفتوگۆو جەدەلی ئیلاهیاتی مەیسحی پێك دەهێنا. بیرمەندانی پلەوپایە ویستی پەرستگا نشین بۆ لابردنی موو لەماستی خۆیان لە بەڵگە هێنانەوەی لۆژیکیدا نوقم کردو باشترین هزرو مێشکەکانی بیرمەندەکان لەم لێهاتوییەدا بۆ ئاشکراکردنی شتە داهێنراوەکان سوودیان وەردەگرت. بەم شێوەیە لۆژیکی ئەرستۆیی کە لە رووی ئیلاهیاتەوە بێ چەندو چۆن بوو، بەشێکی بنەڕەتی لە شەرعیاتی مەسیحی گۆڕدرا.

بەم شێوەیە بەهۆی ئەم گەشەکردن و ئەم کاریگەریەوەلەسەر مەسیحیەت، ئەندێشەکانی ئەرستۆ لە ئەوروپادا گەشەیەکی دی بەهەمان ئەندازەی گرنگ کە لە رۆژهەڵاتدا لە حاڵەتی دروست بووندا بڵاو

بووبونەوەو لەکۆتایدا کاریگەریەکی قوڵی لەسەر ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست دانا.

لەسەدەکانی یەکەمینی هەزارەی یەکەمی زایینی، بەشێکی زۆری بەرهەمی ئەرستۆ لەسەر بیرمەندانی رۆژئاوا بەداپۆشراوی مانەوە. تەنها لە رۆژهەلاتی ناوەڕاسا لێکۆلچەرەوان درێژەیان بە خوێندنەوەو خویچندنی هەموو لایەنەکانی فەلسەفەکەی دا. ئایینی ئیسلام لەسەدەی "٧" حەوتەمی زایینی سەری دەرهێناو بەدوای ئەوەشدا فەتحە فراوانەکانی عەرەبەکان لەسەرتاسەری رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا روویدا. بیرمەندانی موسوڵمان بە خێرای تواناکان و بەهاکانی بەرهەمی ئەرستۆیان دۆزیەوەو لەم بەرهەمانەدا شتێکیان نەدۆزیەوە کە لەگەڵ ئایینی خۆیان دژو پێچەوانەبێت. بۆیە لە رووی ئاراستەی خۆیان و مەبەستی خۆیانەوە راڤەی بۆچوونەکانی ئەرستۆیان دەکرد. زۆر تێپەڕی نەکرد کە فێرکاریەکانی ئەرستۆ بە جۆرێك لە تان و پۆی ئیمانی نوێ رەخنەی گرت کە تاڕادەیەك هەموو فەلسەفەی ئیسلامی بەرێگەی وەرگرتن لە بۆچوون و راڤەکان و خوێندنەوەی ئەندێشەکانی ئەرستۆ دەوڵەمەند بوو. عەرەبەکان بوون کە بۆ یەکەمین جار سەرنجیان بۆ ئەوە رۆیشت کە ئەرستۆ لە ریزی گەورەترین فەیلەسوفەکانە. کاتێك کە جیهانی رۆژئاوا لەسەدەکانی تاریکیدا دەژیا، جیهانی ئیسلام درێژەی بە پێشکەوتنی فیکری خۆی دەدا. ئەو زاراوانەی کە لە زمانی عەرەبیەوە وەرمانگرتن، وەکو جەبر، کهول، کیمیاگەری Alchemy پیشاندەری ئەم میراتە دەوڵەمەندەن. بەلاّم گەورەترین بەهرەیەك کە لە شارستانیەتی ئیسلامەومیەوە وەرمان

گرت و بە دەستمان هێنا، سود وەرگرتن لە ژمارەی عەرەبی بوو. ئەویش لەو کاتەی کە بیرکاری لە جیهانی رۆژئاوادا بەهۆی سود وەرگرتن لە ژمارەی رۆمیەوە شەل بوو بوو. بۆ دەرککردنی ئەم مانایە بەسە بۆ نموونە ژمارە Lxxxvll تەنها سوود وەرگرتن لە ژمارە رۆمیەکان بەسەر XlIV دابەشی بکەین. ئەو دژواریانەی پەیوەستن بە ژمێریاری ووردترەوە راستەوخۆ ئاشکرا دەبن. بێ بەڵگە نیە کە دەڵێت تەنها کەسێکی رۆحی کە لە مێژووی ماتماتیکدا ناوی هاتووە، سەربازێکە کە ئەرخەمیدسی کوشت.

فەلسەفەی ئەرستۆ لە رۆژهەلاتدا بەدەستی دوو بیرمەندی یەکەمینی موسوڵمانان بلاوبوویەوە. ئەبو عەلی حسین کوڕی عبداللە کوڕی سینا (کە خۆش بەختانە لەلای ئێمە بە Avicenna ناوبانگی دەرکردووە.) لە کۆتاییەکانی سەدەی دەیەمی زایینی لە ئێراندا لە دایك بووەو بە گەورەترین و زانایانی جیهانی ئیسلام دەژمێردرێت. دانراوە فراوانەکانی لە زەمینەی پزیشکیدا لە ریزی باشترین بەرهەمە بە جێماوەکاندا جێگەی هەیە کە تاکو ئەو سەردەمە نوسراون، ئەم بەرهەمانە چەند هەوڵ و کۆششێکی شکۆمەند بوون بۆ ئەوەی ئەم بەشە زانستیە لە ئاستی پزیشکی سادە زیاتر بڕوات، شتێك کە پزیشکی کە هەرگیز نەیتوانیوە بە گشتی پشت گوێی بخات. تەنانەت ئیبن سینا هەوڵی دا ئەوەی کە بەباوەڕی ئەو توخمی پزیشکی لەبەرهەمی ئەرستۆدا هەبوو چاکی بکات. ئەو بابەتی جۆراو جۆری دیاری کرد کە ئەرستۆ بە هەندی وەرنەگرتبوون و تەنانەت چەندین وەلامی بۆچارەسەر کردنی ئەم کێشانە پێشنیار کرد.

چەند وەڵامێك كە ئەگەر ئەرستۆ لە هەنگاوی یەكەمدا ئاگاداری ئەم تەواویانەی بدایە مومكین بوو تەرحیان بكات. هەوڵ و كۆششی ئیبن سینا لە بەخشینی رێكخستن و چاككردنی زیاتری ئەندێشەكانی ئەرستۆ، مامۆستایانەو زۆرێك لەبەشە سست و لاوازەكانی بەهێزو پتەو كردووە. بەداخەوە ئیبن سینا لە زۆرێك لە بەرهەمەكانی خۆیدا زۆر دەرگاو دەروازە هەبوون كە ئەرستۆ هەمیشە دەیویست پارێزراوبن، دایخستن. ئەرستۆ دەیزانی كە ناتوانێت هەموو شتێك بزانێت، ئیبن سینا جگە لەمە بیری دەكردەوە.

راڤەكەرێكی گەورەی دیكەی بەرهەمەكانی ئەرستۆ لە جیهانی ئیسلامدا، ئیبن روشد بوو كە لەسەدەی "١٢"دوانزەهەمی زاینیدا لەكاتی فەرمانڕەوایی حوكمەتی عەرەبە مەغرییەكان لە ئیسپانیا دەژیاو پزیشك و فەیلەسوفی تایبەتی خەلیفە "قوتوربە"بوو. ئیبن روشد باوەڕی وابوو كە فەلسەفە بە شێوەیەكی گشتی و فەلسەفەی ئەرستۆ بە شێوەیەكی تایبەتی رێگەی راستەقینەیە بۆگەیشتن بە حەقیقەت. و لە رێگەی گەیشتن بەخواو كەشفی زیاتر لە ئیمانەوە بە تەواوی رێگەیەكی خێراترو زووتر بەدەستەوە دێت. ئەقڵ بە پلە لە ئیمان بەرزترە. (زیاتر لە "٥" پێنج سەدە درێژەی كێشا تاكو بۆچوونی بیڕ باوەڕانە لەم روەوە لە ئەورووپای مەسیحیدا دەربكەن).

رۆژێكیان خەلیفە پرسیاری كرد لە ئیبن روشد وتی: گەردوون و ئاسمانەكان چۆن دروست بوون و بەدیهاتوون، بەم پرسیارە ئیبن روشد بیری پەرێشان بوو. ئەم فەیلەسوفە ناچار بوو كە دان بەوەدا بنێت كە

وەلامی ئەم پرسیارە نازانێت ( ئەم قسەیە هەمیشە شوێنی شایستەی نیە لە وەلامی خەلیفەیەکدا کە بە وەلامدانەوەی پرسیارەکانیان خزمەتیان بکات) دوای ئەمە خەلیفە ریزی لە راستگۆیی ئیبن روشد گرت و ناردی تاکو وەلامی ئەم پرسیارە لە بەهەمەکانی ئەرستۆدا پەیدا بکات.

لە "٣٠" سی ساڵی دواتردا ئیبن روشد ژمارەیەکی زۆر تەفسیرو لێکدانەوەی لەسەر بۆچوونەکانی ئەرستۆ نووسی. زیرەکانە هیچ کات وەلامی پرسیاری بنەڕەتی خەلیفەی نەدایەوە.خودی خەلیفە پێشتر لەم بارەیەوە بۆچونی دەربڕیبوو.بەلام ئیبن روشد ژمارەیەك لە وەلامەکانی خۆی لە ئەرستۆوە بەدەست هێناو تەنانەت لەبەرەو پێشبردنی بۆچوونەکانی خودی خۆی سوودی لە بەڵگەکانی ئەرستۆ وەرگرت.

ئەمە هەمان ئەو ئاراستەو رووکردنە بوو کە لەگەڵ حەزی بیرمەندانی مەسیحی سەدەکانی ناوەڕاست سازگار بوو، ئەوانیش بە خێرایی بەکارهێنانەکانی لە گەڕان و بەدوادا چوون و داهێنانەکانی لەو بوارەدا وەرگرت. راڤەو تەفسیرەکانی ئیبن روشد لە ئەندێشەی ئەرستۆوە وردە وردە لە پاریسدا کە گرنگترین ناوەندی زانستی ئەو رۆژگارە بوو دەست بە دەست گەیشتن بەلام زۆر تێنەپەڕی کە ئیبن روشدیەکان ئەو ناوەی کە ئەم بیرمەندانە بەو ناوەوە ناوبانگیان دەرکردبوو، گرفتاری دەردی سەری بوون، کلێسا دەیتوانی بۆچوون و تیۆرەکانی ئەرستۆ وەربگرێت، بەلام راڤەو تەفسیرە نوێکانی بەرهەمی ئەرستۆ تا رادەیەك بە شێوەی دوور لە ئایینی راست و لە ئایین دەرچوون دەرکەوتن. لە ململانێی نێوان ئەقڵ و ئیمان، هیچ کەس نەیدەتوانی گومانی ئەوە بکان کە قسەی کۆتایی

دەكات. ئیبن روشدیەكان خۆیان لە وێنەی تاوانباردا بینیەوەو تاوانباركران، تەنها رێگەیەك كە دەیان توانی بۆ بەرگریكردن لەخۆیان بیگرنەبەر سوود وەرگرتن بوو لەو بەڵگانەی لەهەمان سەرچاوەی داهێنراوی نوێیان واتە نوسینەكانی ئیبن روشد بوون.

خۆشبەختانە ئەم دۆخە بەهاتنە ناوەوەی "تۆماس ئاكویناس" بۆ نێو مەیدانەكە چارەسەركرا. ئەم پیاوە كە بە گەورەترین بیرمەندی سەدەكانی ناوەڕاست دەژمێردرێت، سەركەوت لە سازشكردنی نێوان ئەم دووكۆمەڵەوە كە لەململانێدابوون. ئاكویناس پێشنیاری كرد كە دەبێت ئەقڵ لەكاركردنی خۆیدا هاوڕا لەگەڵ رێساو یاسا بێ چەندو چۆنەكاندا ئازاد بێت، بەڵام تاكو جێگەیەك كە پێ لەسنوری ئیمان نەباتە دەرەوەو ئەقڵ بەبێ ئیمان هیچ نیە.

ئاكویناس زۆر بەقوڵی پەرێشانی ئەرستۆ بوو؛ بەخێرایی بەهای فراوانی ئەوی دۆزیەوە. ئەو بەشێكی زۆری تەمەنی خۆی لە پێناو ئاشتی نێوان فەلسەفەی ئەرستۆ لەگەڵ فەلسەفەی كڵێسادا سەرف كرد. سەرئەنجام ئاكویناس سەركەوت لەوەی كە ئەرستۆ گەرایی بە شێوەی پایەو بنەڕەتی فەلسەفی ئیلاهیاتی مەسیحی جێگیر بكات. ئەم كارە لە هەنگاوی یەكەمدا بەمانای دروستكردن و لە كۆتاییدا، پاشەكشێی ئەرستۆ گەرایی بوو. كڵێسای كاسۆلیك رایگەیاند فێركاریەكانی ئەرستۆ بەو جۆرەی كە ئاكویناس راڤەی كردوون، (حەقیقەت) و هەركەس ئینكاری ئەم راستەقینەو واقعیەتە بكات، داهێنەرەو سزای داهێنەركارانی بەسەردا دەسەپێت و سزا دەدرێت. (دۆخێك كە تاكو ئەمڕۆش درێژەی هەیە.)

## ساتێک لەگەڵ ئەرستۆ

بەشێکی زۆری نوسینە فەلسەفیەکانی ئەرستۆ باس لە جیهانی سروشتی دەکەن و لەم روەوە دەقی زانستی بوون. زانستیش وەکو فەلسەفە چەند بنەماو حوکمێك دەردەکات کەواپێدەچێت حەقیقەتن، بەلاّم دواتر بەتاڵ بوونەوەیان دەسەلمێت. تیۆریاری زانستی دەبێت پیّ بە پیّ ی زیاد بوونی دەرکی ئێمە لە جیهان، رێك بخرێن و چاکسازیان تێدا بکرێت. کلێسا بەسروش و "وحی" دابەزیوی خوێندنەوەی نوسینەکانی ئەرستۆ خۆی لە گۆشەیەکدا وێناکرد. (گۆشەیەك لەسەر زەمینێکی تەختدا.) لەبەر ئەوە ململانێی نێوان کلێساو دۆزینەوە زانستیەکان ناچاری بوو. ئەرستۆ بەر پرسیاری و بەرپرسی پەیدابوونی ململانێیەکی لەم جۆرەی نێوان ئەقلّ و ئیمان نیە. ململانێیەك کە تاکو سەدەی بسیتەم لەبیرکردنەوەی رۆژئاوادا بە شێوەی رازی بوون بوونی نەبوو.باس و گفتو گۆی چڕو پڕی ویلایەتە یەککرتوەکانی ئەمریکا لە نێوان لایەنگرانی تیۆری و پەرەسەندنی داروین و باوەڕدان بە تیۆری دروست بوون و بەدیهاتن ( حەقیقەتی نێو کتێبی پیرۆز) شتێك نیە جگە لە نموونەیەکی دیکەو دواتر لەم واقیعیەتە (واتە ململانێی نێوان ئەقلّ و ئیمان)

لەگەڵ ئاوابوونی بیرکردنەوەی ئەرستۆیی، خودی ئەرستۆ درێژەی بەرۆڵی لە فەلسەفەی مۆدێرندا داوە. "تۆماس کوهن"، فەیلەسوفی زانست و یەکێکە لە بیرمەندانی هاوچەرخی ئەمریکاو لەو کەسانە دەژمێردرێت کە هەنگاوی بەدوای هەنگاوی ئەرستۆدا هاویشتووە، لەم بابەتەدا سەرسوڕمانی دەربڕی کە چۆن بلیمەتێکی پلە بەرز توانیویەتی لە هەمان

کاتدا توشی هەڵەی سادە بێت. بۆ نموونە: لەگەڵ ئەوەی فەیلەسوفان و ئەستێرەناسان ماوەیەك پێش ئەرستۆ بۆیان دەرکەوتبوو کە زەوی بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، کەچی ئەرستۆ لەسەر ئەم بیروباوەڕە مایەوە کە زەوی چەقی جیهانە هەڵەیەك کە زانستی ئەستێرەناسی ماوەی زیاد لە "١٥٠٠" ساڵ بە توندی سنورداری کرد. لەگەڵ ئەوەشدا بیروباوەڕی ئەرستۆ کە بنەما بوو لەسەر دروستبوونی جیهان کە پێی وابوو چوار توخمە یەکەمینەکان – ئاو، ئاگر، هەوا، خاك ڕێگەی بیرکردنەوەی زانستی بەست. خوێندنەوەی هەڵەکانی ئەرستۆ ڕێگەیان پیشانی "کوهن"دا تاکو تیۆریاری خۆی لەبارەی پێشەنگەکان، یاخود پارادایمەکان دروست بکات و دابنێت. ئەم چەمکەو زاراوەیە بیرکردنەوەی ئێمەی سەبارەت بە فەلسەفەی زانستی لە بنج و بنەواندا گۆڕی و هەروەها چەندین بەکارهێنانیشی لە دەرەوەی حەوزی فەلسەفەی زانستەوە پەیداکرد. بە بۆچونی کوهن، هۆکاری هەڵەکانی ئەرستۆو ڕوانگەی پاش ئەو هاوچەرخەکانی بۆ جیهانی بوون بوو (واتە، پێشەنگی یاخود پارادایمی ئەندێشەکانیان بوو). جیهان لە دیدی یۆنانیە کۆنەکانەوە لە چۆنیەتی یەوە بوو، شتەکانی وەکو شێوە، ئامانج و شتانی وەکو ئەمانە. لەو جێگەیەی کە ئەوان بەم شێوەیە لە جیهاندا ورد دەبوونەوە، (ناچار بوون) بە هەندێك لە ئەنجامی هەڵە بگەن، وەکو ئەو ئەنجامانەی کە تەنانەت ئەندێشەی ئەرستۆشی بە فیڕۆدا.

ئەنجامی وەرنەگرتن و بەهەڵە زانینی ئەم شتانەش لە تیۆریاری کوهن دا سەبارەت بە سەرمەشقی کەسانی پێشەنگ ئەوەیە کە شتێك بەناوی

بینین و سەیرکردنی (راستی) جیهان، چ لە ساتی زانستی و چ لەساتی فەلسەفی بوونی نیە. ئەو ئەنجامانەی کەبە دەستیان دەهێنین بە تەواوی پەیوەستن بەو سەرمەشق و پێشەنگیانەی کە هەڵیان دەبژێرین. رێگەیەك کە بۆ بیرکردنەوە کەبۆ جیهان هەڵدەبژێرین و بە دەربڕینێکی دیکە، حەقیقەتێکی رەها بوونی نیە.

**نوسینەکانی ئەرستۆ:**

ئێمە شەڕ دەکەین بۆ ئەوەی بتوانین لەکاتی ئاشتیدا بژین

ئەخلاقی نیکوماخوس، کتێبی دەیەم ٦٠-b٥ ١١٧٧ئامانجی ژیانە

بوجۆرەی کە دەردەکەوێت کە هەرکام لە هونەرو لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکانمان و لەگەڵ ئەوەشدا هەریەك لە کردارەکانمان و هەڵبژاردنەکانمان، هەوڵدانە بەرەو بەدەست گەیشتنی چاکە و بەدەست هێنانی خێر لەم رووەوە دەتوانین بە تەواوی، خێرو چاکە (بە ئامانجی شتێك) ناو بنێین. بەم حاڵەرە روونە کە لە نێوان ئەو مەبەستانەی کە شتەکان بەرەو ئەو مەبەستانە حەزدەکەن، جیاوازی بوونی هەیە. هەندێك لەم مەبەستانە خودی کردارەکانن، کەواتە ئێستا هەندێکی دیکە لە بەرهەم و ئەنجامەکان پاداشتی کردەوەکانن. لەو جێگەیەی کە مەبەستەکان لە کردارەکان جیان، بە دڵنیایەوە بەرهەمی سەروترو زیاتر لە کردارەکانن. چونکە هونەرو کردارو زانستی جۆراو جۆر بوونی هەیە، بۆیە مەبەستەکانیشیان جۆراو جۆرە. مەبەستی زانستی، پزیشکی،

تەندروستیە، و مەبەستی هونەری لەشکر کێشی سەرکەوتنەو ئامانج و مەبەستی زانستی ئابووری (بەدەست هێنانی) سامانە.

**ئەخلاقی نیکوماخوس، کتێبی یەکەم ١ q ١٩٠٤**

چاکەو خێر بۆ مرۆڤ هەوڵدان و کارو چالاکی دەروون و فەلسەفە بەسەر تەواو کاری (کمال) یاخود فەزیلەت. و ئەگەر کەمالات یاخود فەزیلەتی جۆراو جۆر بوونی هەبێت ئەوە باشترین و تەواوترینیانە. بەلأم ئەم چالاکیە دەبوو لە سەرتاسەری تەمەن درێژەی هەبووایە. چونکە بە گوڵێك نەبەهار دێت و نە رۆژێکی بەهاری. هەربەم جۆرە هەر بەم پێوەرە خۆشبەختی یەك رۆژە یاخود ماوە کورت، هیچ کەسێك بەتەواوی و خۆشبەخت و بەختەوەر ناکات.

**ئەخلاقی نیکوماخوس، کتێبی یەکەم١٩-١٦ q ١٠٩٨**

تراژیدیا نمایشێکی کرداری گەورەیەو کە ئاراستەیەکی جدی لە خۆ گرتووە لە ماوەیەکی دیاری کراودا رووەدات بەلأم لە خودی خۆیدا تەواو بێ کەموکورتیە...چەند رووداوێك وێنا دەکات کە دەبنە ورووژاندنی هەستی سۆزو ترس لە ئێمەی مرۆڤدا، تاکو بەم رێگەیە ئەم جۆرە سۆزو هەستانە کەم ببنەوە.

**هونەری شیعی ٢٨-٢٤ b ١٢٥٢**

ئەو کەسەی سەبارەت بە چۆنیەتی دروست بوون و بەدیهاتنی دیاردەکان لێکۆڵینەوە دەکات، ئیدی ئەو دیاردەیە حوکمەت بێت یاخود هەر شتێکی تر، رۆشنترین دیدو روانین لەو بارەیەوە بە دەست دەهێنن.

سیاسەت ۲۰-۲٤ q ۱۲۵۲

لەبەر ئەوە ئاشکرایە کە دەوڵەت بەدیهێنەری سروشتە... و یەکێك لە تایبەت مەندیەکانی مرۆڤ (کە لە گیانلەبەرانی دیکەی جیادەکاتەوە) ئەوەیە کە ئەو بە تەنها خاوەنی دەرکە لە چاکەو خراپە و عەدالەت و بێ عەدالەتی و هاوشێوەی ئەمانە. و کۆکردنەوەی ئەو بونەوەرە زیندوانەی کە خاوەنی ئەم دەرك و تێگەشتنەن. خێزان و دەوڵەت دروست دەبێت.

سیاسەت ۱۸-۲ q ۱۲۵۳

لە دیدی رێکخستنی سروشتی، وێنای دەوڵەت بەسەر وێنای خێزان یاخود تاك لەپێشترە. چونکە بە پێویست گشت لە پێشترە لە بەش. ئەگەر هەموو بوونی مرۆڤ لە نێو بەریت، ناتوانین بڵێین کە پێیەك یان دەستێکی دەمێنێتەوە، چونکە مرۆڤ سەراپا دەمرێت. مەگەر ئەوەی بە جۆرێك وێنای بکەیت کە دەڵێی لەبەردەست بووە. چیەتی هەرشتێك تەنها لە توانایەکانی و دەستەلاتی ئەو شتە بۆ هێنانەدی ئەو شتانە بەکاری هەڵدەستێت. ئەگەر ئەو توانایەشیان نەبێت یاخود نەتوانن ئەو شتانە بهێننەد، ئیدی هەمان ئەو شتە نامێنێتەوە، بەڵکو هەمان ئەو ناوەی

هەیە. بەم شێوەیە ئاشکرایە کەشار (کۆمەڵگەی سیاسی) لە پێشترە لە تاك، چونکە ئەگەر تاك توانای ئەوەی تێدا نەبێت کە بە تەنها حوکمەتێکی تەواو دروست بکات، ئەوا رێژەی ئەو لەگەڵ شاردا (کۆمەڵگەی سیاسی) بە تەواوی وەکو رێژەی هەر بەشێکی (جزئی) دیکە لەگەڵ گشتی (کل) خۆی. ئەو کەسەش کە ناتوانێت لە کۆمەڵگەدا بژی یان ئەوەندە پشتی بە خودی خۆی بەستووە کە نیازو پێویستی بە هاو ژیانی لەگەڵ خەڵکاندا نەبێت، ئەوا یان دەبێت گیانلەبەر بێت یان خودا. بەم شێوەیە ئەنگیزەی حەزو ئارەزوو لە هەموو مرۆڤەکاندا شاردراوەتەوە تاکو بەم شێوەیە بەیەکەوە پەیوەست بن، ئەو کەسەش کە یەکەمین کۆمەڵگەی مەدەنی بونیادنا گەورەترین سودی بە مرۆڤەکان گەیاند. بەم شێوەیەیە کە مرۆڤ باشترینی گیانەوەرانە (گەورەو بەرێزی هەموو دروستکراوەکان)ە. دروست هەربەو جۆرەی کە لە نەبوونی یاساو عەدالەتدا خراپترینی گیانەوەران بوو. چونکە لە رەگەوە هەڵکێشانی هەر شتێك لە ریشەکەنکردنی بێ عەدالەتی لە سێبەری کردەوەی زبرو زۆردا دژوارتر نیە. بەلآم ئەم زۆرە، خودی مرۆڤە. کە هەم توخمی یاسادانان و دور بیرکردنەوەی تێدا شاردراوەتەوە و هەم توخمی ئازایەتی و بێ بەهرە بوون لە ژیری و دەتوانرێت لەوەش بۆ مەبەستی دادپەروەرانەبەهرە وەربگیرێت. هەم بۆ مەبەستی نادادپەروەری ئەوکەسانەی لە زبرو زۆر بەخراپ سوود وەردەگرن، خراپترین و ئارەزوومەند ترین و ئازاردەرترین بونەوەرانن کە دەتوانرێت وێنا بکرێن، لە لایەکی دیکەوە، عەدالەت هەمان ئەو شتەیە کە مرۆڤەکان بە حوکمەتەوە پەیوەست دەکات، چونکە

کردەوەی دادگەری کە بریتیە لە دامەزراندنی دادپەروەری، بنەڕەتی ڕێکخستن و سامانی کۆمەڵگەی سیاسیە.

**سیاسەت.٤٠-q٢٥ ١٢٥٣**

دیموکراسەکان دانەوەی دیموکراسی لە ئیرادەو بڕیاری زۆرینەوە دەزانن، بەرگریکارانی دەڵێن کە دەبێت ئیرادەو هەڵبژاردن و ویستی کاروبارەکان بە دەستی بە تواناکانەوە بێت. بەڵام ئەم دوو شێوەیە لە گەڵ پێوەری دادپەروەری و یەکسانیدا ناسازگارن. ئەگەر ئیرادەی کەمینە فەرمانڕەوابن، ستەمکاری بەسەر کۆمەڵگەدا فەرمانڕەوا دەبێت لەبەر ئەوە بەپێی پێوەری دادپەروەری هەرکەسێك کە لە کەسانی دیسامانی زیاتر بێت، حوکمەتی ڕەهای بەسەر ئەوانی تردا بە تەنهایی لەسەر حەق و راستیە. لە لایەکی دیکەوە ئەگەر ئیرادەی زۆرینە بەسەر کۆمەڵگەدا فەرمانڕەوا بێت، هەروەك پێشتر وتمان حوکمەت بە دەستگرتن بەسەر ماڵ و سامانی کە کەمینەن و لەبەر ئەوە ماف بڕیاردانیان نیە. کەواتە ئەو چەمکەی بەرامبەر یەکە هەردوو کۆمەڵ بتوانن لەسەری ڕێك بکەون و هەمان بۆچوونیان هەبێت، دەبێت لە پێناسەی (ماف)ەوە وەرگیرا بێت کە لە نێوان هەردوو کۆمەڵەکەدا هاوبەش بێت.

**سیاسەت ٢٨-١٩ q ١٣١٨**

بابەتە ماتماتیکیەکان لە رووی ناوەرۆك و کرۆکەوە لە شتەکان زیاتر نین. ئەوانە تەنها لە رووی پێناسەی لۆژیکیەوەبەسەر شتە هەستپێکراوەکاندا لە پێشترن، نەك لە رووی بوونەوە. بابەتە بیرکاریەکان ناتوانن لە جێگەیەکدا بە شێوەیەکی سەربەخۆو جیا بونیان هەبێت. بەلاًم لەو جێگەیەی ئەوان لە شتە هەستپێکراوەکانیشدا مومکین نیە بونیان هەبێت. لەبەر ئەوە روونە کەبابەتە بیرکاریەکان یان لە بنەڕەتدا بونیان نیە و یان تەنها بەمانای تایبەت بوونیان هەیە کە ئەم مانایە بەڵگە لەسەر بوونێکی سەربەخۆ ناکات. چونکە ((بوون)) دەتوانێت مانای زۆر جیاوازی هەبێت.

**ئەودیو سروشت (میتافیزیک) ١٧-b١٢ ١٠٧٧**

تاکو ئەو جێگەیەی کە پەیوەندی بەتەنە سروشتیەکانەوە هەیە، هەندێکیان گیانیان هەیەو هەندێکی تریان بێ گیانن. بە جۆرێکی دی، هەندێك لەتنە سروشتیەکان توانایەکیان هەیە کە خۆراك وەربگرن و گەشە بکەن و دووچاری خراپ بوون ببن. کەواتە هەر جەستەیەکی سروشتی گیاندار، نەك تەنها لە رووی ناوەرۆکەوە بە ڵکو ناوەرۆکی تێکەڵە، بەلاًم لەو جێگەیەی کە ئەو جەستەیە لە جۆری تایبەتە- واتە گیاندارە- ناتوانێت هەمان ئەو نەفسی و دەروونە بێت، چونکە جەستە بابەتە. کەواتە دەروون بەو مانایە کرۆك و ناوەرۆکە کە وێنەی تەنێکی سروشتیەو ئەمەش بە هێز گیاندارە. ناوەرۆك بەم مانایە کردار بوونە (فعلیت) بەلاًم بەم شێوەیە، دەروون، کرداریەتی تەنی گیاندارە بەلاًم کرداریەت (فعلیت) دووکاری هەیە کە یەکێکیان وەك هەبوونی زانستە و ئەوی تریان وەکو

سود وەرگرتنە لە زانست. کردارێك کە ئێمە قسەی لەسەر دەکەین وەکو هەبوونی زانست و زانیاریە. چونکە هەم خەو هەم بێداریش نیازمەندەو پێویستیان بە دەروون (نفس) هەیە. و بێداریش هەروەك سوود وەرگرتن لە زانستە، ئێستا کەواتە خەو وەکو هەبوونی زانستە بەبێ سوود وەرگرتن لەو زانستە.

**سەبارەت بە نەفس ٢٦-١٧ q ٤١٢**

**رونە کە هۆکارەکان بونیان هەیە و ژمارەشیان بێ شومارە. ئەم هۆکارە** کاتێك لەسەر ئێمە و بۆمان ئاشکرابن کە بپرسین: ((بۆچی ئەم رووداوە رویداوە؟)) ئەمە بەچەند پرسیارێکی گرنگ رێنموویمان دەکات. کاتێك رووبەروو دەبینەوە لەگەڵ ئەو شتانەی گۆڕانیان بەسەردا نایەت. دەپرسین: ((ئەوە چیە؟)) بۆ نموونە لە ماتماتیکدا دەتوانرێت ئەم پرسیارە لە پێناسەی هێڵی راستدا بکرێت یان لە ژمارەکان و نموونەکان یان لەبارەی شتی دیکەوە رەنگە بپرسین: (( چ شتێك بوو بەهۆی ئەم گۆڕانە؟)) **هەر بەو جۆرەی کە بۆ نموونە لە بارەی پرسیاری (( بۆچی ئەم خەڵکانە بۆ شەڕ رۆیشتن؟ )) رەنگە وەڵام ئەمە بێت (( لەبەر ئەوەی هێرش بۆ سنوور کرابوو ))** یان بۆ مەبەستی دیکە دەگەڕێتەوە بە دەربڕینێکی دیکە ئەوان بۆ شەڕ رۆیشتن تاکو فەرمان رەوایی بکەن. **لە گوتەزایەکی دیکەدا، لەو جێگەیەی کە شتەکان دێنە بوون، هۆکارەکەیان مادەیە. ئاشکرای هۆکارەکان لەم روەوە. چەند جۆری جیاواز لە هۆکار بوونی هەیە و هەرکەس کە دەیەوێت بەدوای تێگەیشتن لە سروشتەوە**

بێت دەبێت بزانێت چۆن پەردە لەسەر رویان لادەدات. لە راستیدا، هۆکارەکان چوار جۆرن: مادی، وێنەیی، کرداری و مەبەستی.

**گوێگرتنی سروشتی (فیزیک) ٢٤-١٤ q ١٩٨٩**

لەبەر ئەوەی جوڵە سەرمەدی هەمیشەییە، کەواتە جوڵەی یەکەمیش ئەگەر بوونی هەبێت هەمیشەییە... و لێرەدا ئەوە بەسە کە بە بوونی تەنها جوڵێنەرێك رازیبین کە پێش هەموو شتە نەجوڵاوەکان، شتەکان دەخاتە جووڵەو لەبەر ئەوەی هەمیشەییە، بۆیە سەرەتای جوڵەی هەموو شتەکانی ترە.

**گوێگرتنی سروشتی (فیزیک) ١٤-٧ q ٢٥٩**

ئەرستۆ بە رادەیەك سەبارەت بەبێشوماری شتەکان بێ سنورانە شتی دەنووسی و بیری کردەوە کە لە ژمارەیەك لە بابەتەکان بەهەڵە تێگەیشت.

ئەوکەسانەی کە کونە لوتیان تەمبەڵن دروست وەکو مانگا، ئەوانەی کەسەری لوتیان پان و فراوانە بێ هەستن. دروست وەکو بەراز، بە پێچەوانەوە کەسانێك کە لووتیان نوك تیژە بە ئاسانی تورە دەبن، وەکو سەگەکان . ئەوانەی نووکی لوتیان خڕو سافە بەخشندەن وەکو شێرەکان. ئەوانەی نوکی لووتیان باریکە وەکو باڵندەکانن، بەڵام ئەگەر

لوتیان شێوەی هەڵۆیی و رێك بێت و لە دەموچاو دەرچووبێت، ئەو کەسانە ئامادەی رەفتاری بێ شەرمانەن دروست وەکو قەلەڕەشەکان.

**قیافە ناسی ٣٦-٢٨ ٧١**

ئەرستۆ زۆر هەوڵیدا تاکو لێکۆڵینەوەی زانستی پۆڵبەندی بونیاد بنێت و جێگیری بکات. بەرهەمەکانی لەم زەمینەیەدا حیرەت ئامێزن. بەتایبەت ئەگەر زۆرێك لە پلەو زانیاریە فراوانەکانمان ( لەو سەردەم و رۆژگارەدا) لەم زەمینەیەدا لەبەرچاو بێت، چەند بەڵگەو زانیاریەك کە ئەرستۆ هەندێکیانی جێگیر کردووە. دەوترێت لە نیمچە دورگەی عەرەبدا جۆرێك زیندەوەر دەژی کە ئەگەر هەنگاو بخاتە سەر سێبەری مرۆڤ. نەك تەنها شەلی دەکات، بەڵکو دەستەلأت و توانای قسەکردنیشی لێ دەسێنێتەوە... دوو رووبار لە ئوبوئیادا هەن ئەو مانگایانەی کە "سەر بیس "یان ناوە ئاو دەخۆنەوەو سپی دەبن. ئەو مانگایانەش کە ناویان "نلئوس"ە، کە ئاو دەخۆنەوە رەش دەبن... رووباری "رنوس" لە لایەکەوە پێچەوانەی دیکە دەروات واتە لەلای باکورەوە، ئەو جێگەیەی کە ئەڵمانیەکان تێیدا نیشتەجێن. لە وەرزی هاویندا دەتوانرێت لە ئاوەکانی ئەم کار بە کەشتی بکرێت، بەڵام لە وەرزی زستاندا بە جۆرێك رووی سەرەوەی دەیبەستێت کە خەڵکی دەتوانن هەر بەو جۆرەی کە لەسەر رووی زەوی دەرۆن لەسەر رووی ئەویش هات و چۆبکەن.

**سەبارەت بەشتە بیسراوە سەرسوهێنەرەکان ١٤٥،١٦٨**

**بە درێژایی چەندین سەدە،بەشێکی زۆری ئەرستۆ لەمەیدانی فەلسەفەدا بەشتی تەواو بێ کەموکوڕی دەژمێردرا، راستیەکانی ((راستی**

هەمیشەیی)) بوون کە هەرگیز نەدەکرا ئینکاریان لەگەڵ بکرێت. بەڵام دەرکەوتنی فەلسەفەی نوێ کۆتایی بەوە هێنا کە وردە وردە بیرکردنەوی ئەرستۆیی خرایە کەنارەوە. بە شێوەیەکی تەواو چاوەڕوان دەکرا کە گرنگترین بەرهەمی ئەو واتە لۆژیك، تاکو ئەبەد هەر دەمێنێتەوە، تاکو ئەوکات نیچە هەنگاوی خستە نێو مەیدانەکەوەو تەنانەت لۆژیکیشی خستە ژێر پرسیارەوە:

ئێمە ناتوانین تەنها شتێك پاڵپشتی بکەین و لەگەڵ ئەوەشدا ئینکاری بکەین. ئەمە یاسایەکی ئەزموونی و هزریە و روونکەرەوی هیچ جۆرە ((پێویستیەکی)) لۆژیکی نیەو تەنها ئاماژە بە نەتوانینمان لەم کارەدا دەکات.

لەبۆچونی ئەرستۆدا رێساویاسای شتی دژو پێچەوانە، دڵنیاترین و بنەڕەترین بنەڕەتە: بنەماکانی هەموو بنەماو بنەڕەتە بەڵگە نەویستەکان بەم رێساو یاسایە وابەستەن. کەواتە ئەگەر لە راستیدا بەم جۆرەیە، دەبێت وردبینیەکی زیاترو لێکۆڵینەوە لەو (( پێشگریمانانە)) بکەین کە لە قوڵایەکەیدا شاردراونەتەوە. ((ئەم بنەمایە)) یان شتێك سەبارەت بەکرداری یان سەبارەت بە بوون شتێك دەردەخات. بەجۆرێك کە لە پێشتر لەسەرچاوەیەکی ترەوە ئەو شتەمان دەزانی، واتە بە جۆرێك شتە هەڵگیراوە دژەکان بدرێنە پاڵ ئەو، واتە پاڵ ئەو ((بوون))ە یان بەو مانایەی کە شتە هەڵگیراوە دژەکان نابێت بدرێنە پاڵی. لەم کاتەدا، لۆژیك بەو جۆرەی کە پێشتر گریمانە کراوە، پێویستی بە ناسینی حەقیقەت

نابێت، بەڵکو بە تەواوی پێویستیان بەوەیە بە جیهانێك ببەخشرێن و بدرێنە پاڵی کە ئێمە دەتوانین بە جیهانی حەقیقی لە قەڵەمی بدەین.

لەبەر ئەوە ئەم بابەتە بە جۆرێك بە هێزی خۆی دەمێنێتەوە کە ئایا بنەما یەکەمینەکانی لۆژیك بە تەواوی و کوت ومت لەگەڵ واقیعیەتدا جێ بەجێ دەبن؟ یان ئەوەی بە تەواوی ئامرازو رێگەیەکن بۆمان تاکو چەمکێك ((واقیعیەت)) کە پەسەندی دەکەین. دروست بکەین؟ بۆ وەلام دانەوەی وەلامی ئەرێ بە پرسیاری یەکەم، هەربەو جۆرەی ئاماژەی پێدرا، دەبێت لە بوون، ناسینی پێشینمان هەبێت. (واتە ناسینی پێشتر لە سوود وەرگرتنمان لە بۆژێك بە تەواوی نا پەیوەست بوون پێیەوە.) بەڵگە نەویستە کە ئەمە شتێکی دروست نیە. لەبەر ئەوە، دەستەواژەی ناوبراو بە چیچ جۆرە پێوەرێك نیە بۆ حەقیقەت. بەڵکو تەنها (حوکمێکە) کە دەڵێت (دەبێت) چ شتێك بە حەقیقەت بژمێردرێت.

**نیچە، ئیرادەی بەرەو دەستەلات. بەشی ٥١٦**

**ڕۆژمێری ژیانی ئەرستۆ**

٣٨٤پ.ز ............ ئەرستۆ لە ئەستاگیرا کە دەکەوێتە نیوە دوورگەی هالکیدیکی لە باکوری یۆنان لەدایك بووە

٣٦٧پ.ز ............ دەچێتە ئەکادیمیای ئەفلاتۆن لە ئەسینا و بیست ساڵ لەوێ بەسەر دەبات.

٣٤٧پ.ز ............ کاتێك کە پاش مەرگی ئەفلاتۆن نابێتە بەر پرسی ئەکادیمیا، ئاتن بەجێ دەهێڵێت و لە دەوری هرمیاس، فەرمانڕەوایی ئاتارنئوس لەگەڵ ئاسیای بچوك نیشتەجێ دەبێت.

٣٤٧پ.ز............ لەگەڵ پوتیاس هاوسەرگیری ئەنجام دەدات.

٣٤٤پ.ز............ بەرەو دورگەی نزیك سبوس بەرێ دەکەوێت و لەوێ لە موتیلە نیشتەجێ دەبێت.

٣٤٣پ.ز............ دەبێتە مامۆستای تایبەتی ئەسکەندەری گەورە.

٣٣٩پ.ز............ بۆ ئەستاگیرا دەگەڕێتەوە.

٣٣٥پ.ز............ دەگەڕێتەوە بۆ ئاتن لیسئوم دادەمەزرێنێت وەکو

هاوشانێك بۆ ئەکادیمیا.

٣٢٣پ.ز.......... پاش مەرگی ئەسکەندەر جموجۆڵ و هەستکردن بە
دژە مەقدۆنی لە ئاتن وا لە ئەرستۆ دەکات رابکات.
لە خاکلیس کە دەکەوێتە جەزیرەی ئوبوئیا
نیشتەجێ دەبێت.

٣٢٢پ.ز.......... لەتەمەنی ٦٣ ساڵیدا لە ئوبوئیا کۆچی دوایی دەکات.

**رۆژمێری سەردەمی ئەرستۆ**

٣٩٠ پ.ز ............ شکستی رۆم دەبێتە هۆی وەستانی دەستەلاتی رۆم.

٣٨٠ پ.ز ............ مەرگی ئارسیتوخانس، نوسەری شانۆ نامەی کۆمیدی.

٣٦٧ پ.ز ............ حوکمەت لە رێڕەوی پلەوپایەی کنسوڵی (جۆرە پلەیەکە) لە رۆمدا حوکمەت جێگیری بەخۆیەوە دەبینێت. مەرگی دیونوسی یەکەم، جیارسیراکوس و گەڕانەوەوی دووبارەی کورت خایەنی ئەفلاتۆن بۆ سیسیل.

٣٦١-٣٦٠ پ.ز ............ سێیەمین گەشتی ئەفلاتۆن بۆ سیسیل.

٣٥٢ پ.ز ............ مەرگی شاماو سولوس کە لەماو سەلوم؛ یەکێك لە حەوت سەرسوڕهێنەرەکانی جیهانی کۆن بە خاك دەسپێردرێت

٣٤٨ پ.ز ............ پەیمانی دووەمی نێوان رۆم و تاتار.

٣٤٧پ.ز.............مەرگی ئەفلاتۆن.

٣٣٥ پ.ز ............ ئەسکەندەری گەورە جێگری باوکی، فیلیپی دووەم دەبێت سەردەمی فراوانکردنی دەستەلات دەست پێدەکات.

٣٢٦ پ.ز ...........ئەسکەندەری گەورە دەگاتە دەروازەی هیند، لە
کاتێکدا ئیمپراتۆریەتی لە زۆرترین خۆیدا لەدەریای
ئادریاتیك تاکو لای رووباری سەند درێژ بۆتەوە.
٣٢٣ پ.ز ........... مەرگی ئەسکەندەری گەورە بەدوای خۆیشیدا
پاشەکشێی ئیمپراتۆریەتەکەی.

## کتێبە پێشنیارکراوەکان

١-Johathan Barnes, ed The Cambridge Companion to Aristotle (Cambridge university press, ١٩٩٢).

٢- John. M. Cooper, Reason and Human Good in Aristotle (Tackett ١٩٨٨).

٣- Abraham Edel, Aristotle and His philosophy (١٩٨١).

٤- Martha c. Nussbaum and Amelie O. Rorty, eds, Essays on Aristotles De Anima (oxford university press, ١٩٩٢).

٥- The works of Aristotle, ٢ role (Ency do pedia Britamnica ١٩٩٠)

زنجیرە کتێبی
ناسینی فەیلەسوفەکان

نیچە
سوقرات
ئەرستۆ
ئەفلاتوون
ئیسپینۆزا
ئاکویناس
ئاگوستین قەدیس
دیکارت
سارتەر
کیرکگۆر
ئەنیشتاین
هیگڵ
هیوم
ماکیاڤیلی
لایبنیتس
لاک

سایە

## زنجیرە ناسینی فەیلەسوفەکان

**ناسینی فەیلەسوفەکان زنجیرەیەکە لە ژیانی فەیلەسوفە بەناوبانگەکانو دەرگایەکی کراوەیە بۆ ناسینی بیروڕاو روانگەکانیان. لە هەر کتێبێك لەم زنجیرەیەدا جیا لە خستەڕووی زانیاری سەبارەت بە ژیانی فەیلەسوفەکان، بیرو بۆچوونی هەر فەیلەسوفێك لە پەیوەندی لەگەڵ فەلسەفەدا دەوترێتەوەو هاو ئاراستەیە لەگەڵ رووداو و گۆڕانکارییە هزریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیرییەکانی سەردەمی خۆیاندا. گرنگترین بیری فەیلەسوفەکان بە زمانێکی سادەو روون باس کراوە لە هەمان کاتیشدا لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوی مێژوویی فەلسەفی وەرگیراوەو وردبینیەکی باشی لە سەر بووە. تازەپێگەیشتوانو گەنجانو هەموو خوێنەران کە فەلسەفەیان بەلاوە چێژبەخشە ئەم کتێبانە دەتوانێ هاوڕێو یارمەتیدەرێکی باش بێت بۆ جۆری بیرکردنەوەکانی. رەنگە ببێتە دەسپێکێك بۆ ئاڵوگۆڕ لە ژیاندا.**




# کۆشك

**فرانتس کافکا**

**بەم زوانە...**